# سوڵتان ئەلب ئەرسەلان



توێژینەوەیەکی زانستییە دەربارەی ژیان و کارەکانی ئەم کەسایەتییە

ئامادەکردنی: چرۆ موحەممەد

www.aubyc.com

# بسم الله الرحمن الرحيم

بەڕیزان خوشەویستان ...

ئەم توێژینەوەی بەردەستتان یەکەم و کۆتا توێژینەوە نابیت کە تێیدا بە ووردی و بە شێوازێکی زانستیانە لە گەڵ پەیرِو کردنی بە پێی توانا هەموو ڕێڕەوە زانستیاکانی لێکۆڵینەوەی بە شێوەیەکی وورد ڕەچاو کردووە .

ئێمە لێرە مەبەستمانە کە زۆرترین سود بگەیەنین بە خوێنەران و خوێنکارانی زانکۆ و پەیمانگاکان تا بتوانن بیکە سەر چاوە یەکی زانستی بۆ هەر جۆرە لێکۆڵینەوەیك کە بیان هەوێت ئەنجامی بدەن ، بۆیە لەم سۆنگەوە داواکارین لە هەموو لایەك ئەگەر هەر توێژینەوە یەکی زانستی یاخود کتێبێکی بە سودیان لایە بۆمان بنێرن بەم ناو نیشانانەی لای خوارەوە ، ان شاء الله بەم زووانە بەشی ماڵپەڕەکەمان بۆ ئەم بابەتە تەرخان دەکەین .

٠٧٧٠١٩٣٢٧٤٩

renwen٢٠٠٩@yahoo.com

aubyc@aubyc.com
www.aubyc.com

## ناوەندی ئەیوبی

# پێشکەشە

– بە دایك و باوك و خوشك و براكانم كە سەركەوتن و سەربەرزیی و بەختەوەریی ژیانم لە بوونی ئەواندا دەبینمەوە.

– بە (زەكیە، ڕەنگین، ئاشنا، سۆما، فێنك، سمیە) كە بوونیان لە ژیانمدا وەك خەزێنەیەكی گەوهەردار پڕ بایەخە.

– بە مامۆستا بەڕێزەكانم لە سەرجەم قۆناغەكانی خوێندندا.

# سوپاس و پێزانین

- سوپاس و ستایش بۆ خودای گەورە و میهرەبان کە بۆ تەنها چرکە ساتێکیش بێ ئاگا نی یە لێم و پشتیوان و هەڵسوڕێنەری هەموو کارێکمە.

- سوپاس بۆ بەڕێز (د.صلاح کانبی) کە سەرپەرشتی توێژینەوەکەمی گرتە ئەستۆ و بە سەرنج و تێبینیەکانی بابەتەکەی دەوڵەمەندتر کردم.

- سوپاس بۆ هەردوو برای بەڕێزم (کاك نیهاد، م.فاڕووق) کە دڵسۆز و هاوکارم بوون لە ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیەدا.

- سوپاس بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی لە کاری وەرگێڕاندا یارمەتیان دام.

- سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی بۆ تەنها چرکەیەك لەگەڵمدا ماندوو بوون لە ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیەدا.

# لیستی هێما کورت کراوەکان

| | |
|---|---|
| س.پ | سەرچاوەی پێشوو |
| م.س | مصدر سابق |
| ن.م | نفس المصدر |
| ت،ر | ترجمة |
| و | وەرگێڕ |
| ت | توفی |
| ل | لاپەڕە |
| ص | صفحة |
| ز | زاینی |
| ك | كۆچی |
| د–ت | دون تأريخ |
| د–م | دون مكان طبع |
| ط | طبع |

# پێڕست

**بابەت** **لاپەڕە**

# پێشەكی

سەرهەڵدانی سەلجوقیەكان لە سەدەی پێنجەمی كۆچی/ یانزەیەمی زایینی، لەسەر شانۆی ڕووداوەكانی هەرێمەكانی دەوڵەتی عەباسی، بووە هۆی دروستكردنی گۆڕانی گەورە بەسەر نەخشەی سیاسی ئەو ناوچانە، چونكە سەلجوقیەكان كاریان كردە سەر هەموو لایەنەكانی ژیان، بەتایبەتیش دوای ئەوەی هاتنە نێو (بەغداد)ی پایتەختی دەوڵەتی عەباسی لە ساڵی (٤٤٧ك، ١٠٥٥ز)، كۆتاییان بە دەسەڵاتی بوەیهیەكان هێنا و جێیان گرتەوە.

ئەلب ئەرسەلانی سەلجوقیش وەك كەسایەتیەكی دیار و بەناوبانگی ناو دەوڵەتی سەلجوقی لەو سەردەمەدا دەركەوت و دەوڵەتی عەباسیان ڕزگار كرد لە تێكشكانێكی مسۆگەر، چونكە لەو كاتەدا دەوڵەتی عەباسی پارچە پارچە ببوو، تووشی لاوازی و بارێكی شڵەژاو هاتبوو، بۆیە ئەلب ئەرسەلان ڕۆڵێكی گرنگ و بەرچاوی گێڕاوە لە پاراستنی وولاتی ئیسلام و موسوڵمانان و ڕزگاركردنیان ئەمە لە لایەك، لە لایەكی تریشەوە لە سەردەمی ئەم سوڵتانەدا دەوڵتی سەلجوقی بەهێزی و فراوانییەكی گەورەی بەخۆیەوە بینی بەجۆرێك زۆرێك لە مێژوونووسان بەهێزیی سەلجوقییەكان دەگەڕێننەوە بۆ سەردەمی ئەم سوڵتانە.

لەبەرئەوە لێكۆڵینەوە و ناساندنی كەسایەتی ئەلب ئەرسەلان كارێكی شیاو و بە بایەخە و مەبەستیشمان لە هەڵبژاردنی ئەم بابەتە بۆ زیاتر شارەزابوونمانە لە ژیان و ڕۆڵی ئەم كەسایەتییە لەناو دەوڵەتی سەلجوقی دا، چونكە ئەلب ئەرسەلان كەسایەتییەكی بەهێز و لێهتوو و دادپەروەری سەردەمی خۆیەتی، بۆیە سەرنجی بەلای خۆیدا ڕاكێشام و هانی داین تا زیاتر لەبارەی ژیان و سەردەمی دەسەڵاتداریێتی یەكەی بزانین، كە بە ناودارترین كەسایەتی سەردەمی خۆی دادەنرێت.

گرنگی ئەم توێژینەوەیەش شارەزابوونمانە لە مێژووی ئیسلامی بەوپێیەی مێژووی ڕابردوو و ئێستامان پەیوەستە بە یەكترەوە، دیاریشە كە مێژووی ئیسلامیش هەڵگری كۆمەڵە ڕووداوێكە لە ڕابردوودا ڕووی داوە و پێویستە توێژینەوەی لەسەر بكرێت و بێئاگا نەبین لێی.

توێژینەوەكەمان كردووە بە دەروازەیەك و دوو بەشەوە، بەشی یەكەمی لە دوو باس پێكهاتووە، بەشی دووەمیش لە سێ باس پێكهاتووە، كە دەروازەی توێژینەوەكە باس لە ڕەچەڵەكی سەلجوقییەكان دەركەوتنیان و دامەزراندنی دەوڵەت بۆ خۆیان و دواتر هاتانیان بۆ ناو خەلافەت دەكات.

بەشی یەكەم بریتی یە لە: سوڵتان ئەلب ئەرسەلان و وەرگرتنی دەسەڵاتی، باسی یەكەمی باس لە ژیان و كەسایەتی سوڵتان دەكات، لە باسی دووەمدا باسمان لە دەركەوتن و ڕۆڵی سوڵتان لە پێش دەسەڵاتداریدا و چۆنیەتی وەرگرتنی دەسەڵاتی و بوون بە سوڵتانی كردووە.

بەشی دووەمیش بریتی یە لە: سەردەمی دەسەڵاتی سوڵتان ئەلب ئەرسەلان، باسی یەكەم باس لە كارە فراوانخوازییەكانی دەكات، كە ئەویشمان كردووە بە دوو تەوەرەو، تەوەرەی یەكەم باس لە هەڵمەتی ئەلب ئەرسەلان بۆ سەر شام و گرتنە خۆی حلب دەكات، تەوەرەی دووەمیش باس لە شەڕی مەلازگرد لە ساڵی (٤٦٣ك/ ١٠٧١ز) دەكات و گرنگترین دەرەنجامەكانی ئەو شەڕە لەسەر داهاتووی دەوڵەتی بیزەنتە و جیهانی ئیسلامی خراوەتە ڕوو، لە باسی دووەمیشدا ئاماژەمان بە نیزامولمولكی وەزیری بەناوبانگی سەلجوقی و ڕۆڵی لە بەهێزكردنی دەسەڵاتی ئەلب ئەرسەلان دا داوە، لە باسی سێهەمیش دا باسمان لە كوژرانی سوڵتان ئەلب ئەرسەلان و كۆتایی هاتن بە دەسەڵاتی كردووە.

بۆ ئەم بابەتە متیۆدێکی زانستی مێژوویمان گرتۆتەبەر لە پاڵ لایەنی زانستی و مێژوویەکەشدا متیۆدی فکری و سیاسیمان بەکارهێناوە.

لەم توێژینەوەیەدا پشتمان بە سەرچاوەی عەرەبی، سەرچاوەی کوردی، چەند سەرچاوەیەکی فارسی بەستووە. لە گرنگترین ئەو سەرچاوانەش ((الحسینی: اخبار–الدولە السجلوقیە، الاصفهتنی: تاریخ الدولە ال سلجوق، علی محمد الصلابی: دولە السلاجقە، حسین امین: العراق فی العصر السلجوقی،...هتد)).

بێگومان نوسینی ئەم بابەتەش بێکێشە وکەم و کورتی و ئاستەنگ نەبووە، کەمی سەرچاوە بوو بە زمانی کوردی، زۆربەی سەرچاوەکانی توێژینەوەکە بە زمانی عەرەبین، هەروەها نەبوونی کاتی پێویست کە وای کرد نەتوانم بۆ باسکردنی ئەم بابەتە بە تەواوی خۆم ئامادە بکەم و حەقی تەواوی خۆی پێبدەم، بەڵام لەگەڵ ئەو ئاستەنگانەش هەوڵمان دا بەردەوام بین، ئەمەش لە پێناو زیاتر تیشك خستنە سەر ئەم کەسایەتیە ناوادارە و ڕوونکردنەوەی کار و ڕۆڵ و چالاکیەکانی لە سەردەمی خۆیدا.

لە کۆتایشدا ئەم توێژینەوەیەی لە بەردەستدایە لە هەڵە و کەموکورتی بەدەر نییە بە هیوام بە تێبینی یەکانتان توێژینەوەکەم زیاتر دەوڵەمەند بکەن.

# دەروازە

# ڕەچەڵەکی سەلجوقیەکان و هاتنیان بۆناو خەلافەت

دەرکەوتنی سەلجوقیەکان لەسەر شانۆی ڕووداوەکان لە مێژووی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و خەلافەتی عەباسی دا کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لە گۆڕینی بارودۆخە سیاسیەکانی ئەو ناوچەیە.[١]

جیهانی ئیسلامی لە سەدەی پێنجەمی کۆچی (سەدەی یانزیەمی زایینی) گیرۆدەی کێشە ناوخۆی و دەرەکییەکان ببویەوە، خەلافەتی عەباسی پارچە پارچە ببو، خەلیفە (القائم بامرالله)[٢] ش هیچ دەسەڵاتێکی ڕاستی خەلافەتی نەبوو.[٣]

ئومەوییەکان لە ئەندەلوس دەسەڵاتیان هەبوو[٤]، فاتیمیەکان (عبیدیەکان) لە باکووری ئەفریقیا و میسریش دا[٥]، پاشان فارس و ئەودیو ڕووباریش لە دەست بوەیهیەکان دا بوو[٦]، لەگەڵ فراوان بوونی دەوڵەتی بیزەنتە لەسەر حسابی خەلافی عەباسی لە شام.[٧]

لاوازی خەلافەتی عەباسی بووە هۆی دروست کردنی بارێکی شلەژاو فەوزا لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی، ئەوکاتە تووشی لەبەریەك هەڵوەشانەوە و توانەوە هاتبوو، کاتێك سەلجوقیەکان لە مەیدانی سیاسی خەلافەتی دەرکەوتن باری خەلافەتی عەباسی بەوجۆرە بوو.[٨]

ئەوەبوو ئەو هێزە تورکیە نوێیە لە ڕۆژهەڵات دەرکەوتن و خەلافەتی عەباسیان ڕزگار کرد لە تێکشکاندنێکی مسۆگەر، زیندویی و چلاکیان بەخشیەوە بە موسوڵمانەکان.[٩]

سەلجوقیەکان بەشێکن لە لقەکانی هۆزی غوزی تورکی[١٠]. نشینگە و شوێنیان لە ناوچەی ئەودیو ڕووبار، ئەوەی کە ئەمڕۆ بە تورکستان دەناسرێت و لە بانی مەنغولیا و باکووری چین لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ دەریای خەزەر (دەریای قەزوین) لە ڕۆژئاواوە و لە دشتای سیبیریا لە باکوورەوە بۆ نیمچە دوورگەی هیندی و فارس لە باشوور بوو.[١١]

---

[١] الاصفهاني: تاريخ دولة ال سلجوق، ط، دار الكتب العلمية، (بيروت، ٢٠٠٤ز، ص ٣ " الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، و احمد عبدالرحمن و نهاد جلال، چاپی یەکەم، دارالمعرفة، (بيروت، ٢٠٠٧ز)، ل ٣٧.

[٢] القائم بامر الله: باوکی جعفری عبدالله کوڕی قادر لە ساڵی (٣٩١ك/ ١٠٠١ز) لەدایك بووە، کاتێ باوکی مرد بوو بە خەلیفە لە (١١ی ذی الحجةی ٤٢٢ك/ ١٠٣٠ز) کە پەیمانی هەر لە ژیانی باوکی دا وەرگرتبوو، ئەو لەقەبەی (قائم بامر الله)ی پێوە نابوو، دایکی ئەرمەنی بووە ناوی (بدر الدجى) بووە، لە ساڵی (٤٦٧ك/ ١٠٦٥ز) مردوو، ماوەی خەلافەتی ٤٥ ساڵ بووە. بڕوانە لە:(سیوطي: مێژووی خەلیفەکانی ئیسلام، و نصرالدين عبدالرحمن قادر، چاپی یەکەم، ٢٠٠٧ز، ل ١٧٩).

[٣] الاصفهاني: م.س،ص٣ " محمد سهيل طقوش: تاريخ الدولة العباسية، ط، دار النفائس، ( بيروت، ٢٠٠٥ز)، ص ٢٣٧.

[٤] القلقشندي: صبح الاعشى في صناعة الانشا، ط١، دار الفكر، (دمشق، ١٩٨٧ز)، ج٢،ص١٢٢.

[٥] الذهبي: العبر في خبر من غبر، ط٢، مطبعة حكومة الكويت، ١٩٨٤ز، ج٢،ص١٩٩.

[٦] الحسيني: صدرالدين بن علي: اخبار الدولة السلجوقة، (لاهور، ١٩٣٣ز)، ص٢-٣.

[٧] الاصفهاني: م. س، ص٣، زبيدة عطا، الترك في العصور الوسطى، دار الفكر العربي، د-م، د-ت، ص٣٨.

[٨] عبدالنعيم محمد حسنين: سلاجقة ايران و العراق،ط٢، مطبعة السعادة، (د-م، ١٩٧٠)ص١٣ " محمد سهيل طقوش: تاريخ الدولة العباسية، ص٢٣٧، نیشتمان بەشیر محمد: کوردستان سەلجوقیەکان، و ئیدریس عەبدوڵڵا موستەفا، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، (هەولێر،٢٠٠٦ز)، ل٩٣.

[٩] الذهبي: تاريخ الاسلام، ط٢/ دارالكتاب العربي، (بيروت، ٢٠٠٢ز)، ج٢، ص٢٠-٢٢.

[١٠] الذهبي: العبر في خبر من غبر، ج٣، ص٢٣٧ " تاماراتالبوت رايس: السلاجقة تاريغهم و حضارتهم، ت،//لطفى الغوري و ابراهيم الداقوقي، مطبعة الارشاد، (بغداد، ١٩٦٨ز)، ض٩، سيف الدين الكاتب" اطلس تاريخ العرب و العالم، الاصدار الاول، دارالشرق العربي، (سوريا،٢٠٠٥ز)، ص٨٠، تاريق محمد عبدالرحيم: ڤلادیمیرف. مینۆرسکی، و ئازاد عوبێد صالح، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٥ز)، ل١٣٤.

[١١] الاصغهاني: م.س، ص٧ " الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی ل٣٣ " محمد سهيل طقوش: تاريخ الدولة العباسية، ص٢٣٧.

دەگەڕێندرێتەوە سەر باپیرە گەورەیان کە (سەلجوقی کوڕی قادر)ە، کاتێك (دقاق)[١٢] کوڕێکی بوو بە ناوی سەلجوق بە گەورەبوونی سەلجوق هێمای لێهاتووی و بەهێزی لیَ بەدەرکەوت، سەلجوق سەرکردایەتی هۆزەکەی کرد و ئاسۆیەکی فراوانی لە بەردەم هۆزەکەی کردەوە و یەکیخستون و هێز و دەسەلاَتی بۆ دروست کردوون، بۆیە بە ناوی ئەوەوە ناسراون، ئەمانە لە ژێر دەسەلاَتی (بیغوا) دا بوون کە پاشایەکی تورك بوو لە وولاَتی تورکستان دا.[١٣]

کاتێك سەلجووق وەك کەسایەتیەکی بەهێز دەرکەوت پاشای تورك (بیخوا) لە خۆی نزییك کردەوە و دەستەلاَتی دایە دەست، خەڵك هێندە گوێڕایەڵی سەلجووق بوون تا ڕادەی ئەوەی ژنی پاشا ترسی لیَ نیشت و پاشای هاندا تا سەلجووق بکوژێت.[١٤]

سەلجووق کە ئەمەی بیست بەخۆی و خێڵەکەیەوە بەرەو وولاَتی ئیسلامی چوو، بووە یەکێك لە موسوڵمانەکان وەك موسوڵمانانی تر، لە شاری (جند).[١٥] نیشتەجێی بوون و کردیانە بنکەی خۆیان.[١٦] جگە لەم هۆکارە کۆمەڵێ هۆکاری دیکە بوونە هۆی کۆچ کردنیان کە مێژوونووسان هەندێك لەو هۆکارانەیان باس کردووە لەوانە خراپی باری ئابووری ئەو ناوچانە بیابانیە یان بە هۆی ئەو شەڕانەی لە نێوان هۆزە جیاجیاکان دا ڕوویان دەدا، کەوتوونەتە بە چەندین فشاری گەورەی هۆزەکانی تر کە ژمارە و توانایان لەوان زیاتر بوو، کە مەغۆلەکان، بۆیە دەستیان کرد بە کۆچ کردن بەرەو وولاَتی ئەودیو ڕووبار، ناچار بوون بەرەو ڕۆژئاوا ئاڕاستە وەربگرن و لە نزیك کەنارەکانی ڕووباری جەیحون دا دابەزن.[١٧]

سەبارەت بە ئایینیشیانسەلجوقیەکان لە ناوچەیەك دا بوون کە ئایینە جیاوازەکان تیایدا هەبوو وەك جولەکە و مەسیحی و شامانی و ئیسلام و چەندێکی تر[١٨]. دوای گەیشتنیان بە جیهانی ئیسلامی لە ئەنجامی هاوسێیەتیان لەگەڵ موسوڵمانەکان مەزهەبی سونییان وەرگرت و بە وورە و گڕوتینەوە کەوتنە سەرخستنی ئەو مەزهەبە، سەلجوقیەکان کە بوونە موسوڵمان بە یاسا و ڕێساکانی ئیسلام پابەند بوون و لە پێناو سەرخستنی ئیسلام چوونە چەندین شەڕەوە[١٩]. ئەم موسوڵمان بوونەشیان بووە هۆیەك بۆ نزیك بوونەوەیان لە فەرمانڕەوایانی وولاَتانی دەوروبەر[٢٠]. بەتایبەتیش سامانییەکان، چونکە لەوکاتەدا شەڕی نێوان (سامانی و قەراخانیەکان) ڕووی دا[٢١]. قەراخانیەکان دەستیان بەسەر (بخاری)[٢٢] دا گرتبوو، سامانیەکان پەنایام بردە بەر سەلجوق و

---

[١٢] تقاق یان دقاق: پیاوێکی ناوداری تورکەکان بوو، ناوەکەی بە زمانی عربی واتە (کەوانی ئاسن) ، ئەو یەکەمین کەس بوو کە موسوڵمان بووە، خاوەن ڕەئیەکی زۆر بوو، گەلەکەی زۆر گوێڕایەڵی بوون. وەرگیراوە لە:(الاصفهانی: م.س،ص٧، الذهبي: تاريخ الاسلام، ج٢، ص١٦١).

[١٣] القلقشندي: م.س، ج٤، ص ٤١٧ " محمد خضري بك: محاضرات تأريخ الامم الاسلامية الدولة العباسية، ط٧، دار المعرفة، (بيروت، ٢٠٠٥ن)، ص٣٥١ " محمد فتحي أمين: الغرو والمغلى لديار الاسلام، ط١، (سوريا، ٢٠٠٥ن)، ص ١٩.

[١٤] ابن أثير: الكامل في التأريخ، دار الكتاب العربي، (بيروت، ٢٠٠٦ن)، ج٧، ص٢٣٦ " الصلابي: دولة السلاجقة، ط٣ دار المعرفة، (بيروت، ٢٠٠٦.)، ص٢٣.

[١٥] جەند: ناوی شارێکی گەرەیە لە وولاَتی تورکستان، یەکێکە لە شارەکانی ئەودیو ڕووبار، دەکەوێتە نزیك ڕووباری سەیحون، نێوان ئەو شارە و خەوارزم لە کۆن دا ١٠ ڕۆژە ڕێ بووە، دانیشتوانەکەی موسوڵمانن و لەسەر مەزهەبی حەنەفین، بڕوانە لە: (ياقوت الحموي، معجم البلدان، دار صادر، (بيروت، ١٩٥٧ن)، ج٢، ص١٦٨-١٧٠).

[١٦] الاصفهانی: م.س،ص٧، ابن كثير: البداية و النهاية، ط، دار الفجر للتراث، (القاهرة،٢٠٠٣ن) ج١٢، ص٤٨.

[١٧] الصلابی: دەوڵەتی عوسمانی، ل٣٣،عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص١٦،محمد سهيل طقوش: تاريخ الدولة العباسية، ٢٣٨، نیشتمان بەشیر محمد: س.پ،ل٩٥.

[١٨] تاماراتالبوت رایس: م.س، ص٢٢.

[١٩] محمد سهيل طقوش: تاريخ الدولة العباسية، ص٢٣٨، نیشتمان بەشیر محمد:س.پ،ل٩٦.

[٢٠] نیشتمان بەشیر محمد: س.پ،ل٩٦.

[٢١] ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، ط٥، دار القلم، (بيروت، ١٩٨٤ن)، ج٤، ص٤٧١.

ئەویش بە سوپاکەیەوە یارمەتی دان و دەسەڵاتی بۆ گێڕانەوە، سامانیەکان بە هۆی ئەوەوە توانیان سەرکەون بەسەر قەراخانیەکان و (بخاری) بە دەست بهێننەوە[23]. هاتنی سەلجوقیەکان بۆ ناو جیهانی ئیسلامی، رایکێشان بەرەو بەشداری کردن لە ڕووداوەکان و بووە هۆیەك بۆ دەرکەوتنیان لە ڕووی سیاسی یەوە.[24]

سەلجوق لە شاری (جەند) کۆچی دوایی کرد، لە دوای خۆی چەند کوڕێکی جێهێشت لەوانە: (ئەرسەلان، میکائیل، موسا)، کوڕەکانیشی هەموویان مردن، میکائیل لە شەڕی دژ بە تورکەکان کوژرا و لە دوای خۆی چەند کوڕێکی جێهێشتن لەوانە: (بیغوا، توغرول بەگ، جەغری بەگ داود).[25] توغرول بەگ و داود وەکو دوو کەسایەتی ناودار و بە توانا دەرکەوتن و ڕۆڵێکی گەورەیان بینی لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ خۆیان

بە تایبەتی توغرول بەگ سەرکەوێت لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ سەلجوقیەکان.[26]

هەرەیك لە توغرول بەگ و داود ڕوویان لە (بخاری) کرد، لەوێ توشی شەڕی میری (بخاری) بوون، ئەوانیش لە ترسی ئەو پەنایان بۆ لای میری تورکستان (بوخراخان) برد، بە گومان و ترسەوە لە ویستیان دەروانی، بۆیە بریاریان دا بە یەکەوە نەبن بەڵکو یەك یەك بچن و ئەوی تریان لە ناو قەومەکەی بمێنێتەوە[27]. بوخراخان دەیویست بە یەکەوە بیانگرێت، بەڵام بۆی نەکرا، تەنها توغرول بەگی گرت، بەڵام داودی برای توانی ڕزگاری بکات و دواتر گەڕانەوە بۆ بنکەی خۆیان (جەند) کە دوور نیە لە بخاری[28].

هێزی سەلجوقیەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە گەشەسەندن و بەرەوپێش چوون دا بوو، تا وایان لێهات لە توانایان دا بێت هەڕەشە لە دەوڵەتەکانی ناوچەکە و لە نێوانیشیان دەوڵەتی غەزنەوی بکەن، دەستیان بەسەر کۆمەڵێك شاری وڵاتی ئەودیو ڕووباردا گرت، لەوانە: (بەڵخ و نەیسابور و توس و جورجان)، هەروەها دەستیان بەسەر زۆربەی شارەکانی خوراسان دا گرت[29].

لە ساڵی (٤٢٨ك/١٠٣٦ز) لە (مەرو) وتار بۆ داود خوێندرایەوە و نازناوی میری میرانی لێنراوە، توفرول بەگیش چووە نەیساربوور و وتاری بۆ خوێندرایەوە و نازناوی سوڵتانی گەورەی لێنرا[30].

ئەم دوو سوڵتانە دوای شەڕ و پێکدادانێکی زۆر لەگەڵ دەوڵەتی غەزنەوی و هێزەکانی تری ناوچەکە،ململانێ و ناکۆکیان لەگەڵ غەزنەویەکان نزیکەی ٣ ساڵی خایاند، تا توانیان سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست بهێنن لە شەڕێکی جیاکەرەوەی نێوانیان لە (٩ی ڕەمەزانی ٤٣١ك/٢٤ی ئایاری ١٠٤٠ز) لە نزیك (داندانقان)ی نێوان سەرخەس و مەڕو ڕوویدا، ئەم شەڕە بە شکانی غەزنەویەکان و سەرکەوتنی سەلجوقیەکان کۆتای هات. سوڵتان توغرول بەگ لە ئەنجامی سەرکەوتنی بەسەر سوڵتان مسعودی کوڕی محمودی غەزنەوی لە

---

[22] بخاری: لە گەورە شارەکانی ئەودیو ڕووبارە، نێوانی لەگەڵ جەیحون دوو ڕۆژە ڕێیە، هێز و دەسەڵاتی سامانیەکان لەوێ بوو، نێوانیشی لەگەڵ سەمەرقەند ٧ ڕۆژە ڕێ و ٣٧ فەرسەخە. وەرگیراوە لە: (یاقوت:م.س، ج١، ص٣٥٣).

[23] کارل بروکلمان: تاريخ الشعوب الاسلامية، ت، ر/ نبيه امين فارس و منير البعلبكى، ط٢، (بيروت، ٢٠٠٠ز)، ص٧٢، حسن كريم جاف: الوجيز في التاريخ ايران، ط٢، (هەولێر، ٢٠٠٨ز)، ج٢، ص١٢٦، محمد خضرى بك: تاريخ الدولة العباسية، ص٣٥١، زبيدة عطا:م.س، ص٣٩.

[24] نیشتمان بوشیر محمد: س.پ،ل٩٧-٩٧.

[25] ابن الاثير:م.س،ج٢،ص٢٣٧.

[26] ابن كثير: م.س،ج١٢، ص٤٨، محمد خضرى بك: چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی، و/ نهاد جلال، چاپی یەکەم، (بیروت،٢٠٠٨ز)،ل١٤٧.

[27] ابن اثير: م.س، ج٢، ص٢٣٧.

[28] لالاصفهانى: م.س، ص١٤، محمد خضرى بك: محاضرات تاريخةالامم الاسلامية...، ص٣٥١.

[29] نیشتمان بەشیر محمد: س.پ،ل٩٨.

[30] الاصفهانى: م.س، ص١٤، محمد خضرى بك: چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی، ل١٤٦، کارل بروکلمان: م.س، ص٢٧٢.

شەڕی (داندانقان) دا دەستی بەسەر خۆراسان دا گرت و دەوڵەتێکی گەورە و سەربەخۆی بۆ سەلجوقیەکان لە خۆراسن دامەزراند.[31]

سوڵتان تورغول بەگ خۆی لە خەلیفەی عەباسی (القائم بأمر الله) نزیك کردەوە و هەوڵی دا لە خۆی ڕازی بکات بۆئەوەی دان بنێت بەو دەسەڵاتەی کە لە خۆراسان دایمەزراندبوو، بەڵام خەلیفە بۆ ساڵی داهاتوو واتە (٤٣٢ك/ ١٠٤١ز) دانی بە دەسەڵاتی دا نا[32].

بەڵام ئەمە هیچی لە بارۆدۆخەکەدا نەگۆڕی، دان پیانانی خەلیفە شتێکی ڕۆتینی بوو تەنها بۆئەوەی زیاتر ماف یاسایی بۆ خۆی دەستەبەر بکات و خەڵکی لێی ڕازی بێت، چونکە دەستەڵاتی عەباسی لەوکاتەدا لاواز بوو هەمیشە دانی دەنا بە دەوڵە سەرکەوتووەکان.[33]

سەلجوقیەکان لە بازنەی داننانی خەلیفەی عەباسی دا بە ئامانجی ڕزگار کردنی خەلافەتی عەباسی و مەزهەبی سوننی لە ژێر دەستی بوەیهیەکان درێژەیان بە سیاسەتی فراوانخوازی خۆیان لە فارسدا تا ڕێگە بۆ کشانی قەڵەمڕەویان بەرەو عێراق خۆش بکەن.[34]

لە ساڵی (٤٣٢ك/١٠٤١ز) دەسیان گرت بەسەر (ڕەی) دا و، بۆ ساڵی دواتریش دەسیان گرت بەسەر (جورجان و تەبەرستان)[35]، لە ساڵی (٤٣٤ك/١٠٤٣ز) سوڵتان تورغول بەگ خوارزمی گرتە دەست، دواتریش وڵاتی شاخ و هەراد و کرمانی گرتە دەست[36] دوای ئەوە لە ساڵی (٤٣٧ك/ ١٠٤٦ز) ناوچەی چیا و هەمەدان و دینەوەری گرتەدەست[37] پاشان تورغول بەگ درێژەی بە کارە فراوانخوازیەکانی دا و لە ساڵی (٤٤٣ك/ ١٠٥٢ز) دەستی گرت بەسەر اصفهان دا و کردی بە پایتەختی خۆی[38] پاشان لە ساڵی (٤٤٦ك/ ١٠٥٤ز) دەستی گرت بەسەر هەرێمی ئازەربایجان و لەوێشەوە ڕوویان کردە ئەرمینیا و دەستیان بەسەردا گرت[39] بەم جۆرە دەوڵەتی سەلجوقیە گەورەکان لە خۆراسان و فارسدا دامەزرا و سوپاکانیان تەواو ئامادە بوون تا بچنە ناو عێراق[40].

لەوکاتەدا باری ناوخۆی بەغداد شڵەژابوو، بارێکی پشێوی و ناجێگیری و بێ سەروبەری دایگرتبوو، ئەمە یارمەتی ئەمەی دا ڕێگە لە بەردەم سەلجوقیەکاندا خۆش بێت تابچنە ناو بەغدا و عێراق بدەنە پاڵ ئەو دەوڵەتەیان کە لە خۆراسان و فارسدا دایان مەزراندبوو.[41] ئەمەش بە هۆی ململانێی ناوخۆی ناو بنەماڵەی بوەیهیەوە ڕووی دا، چونکە ململانێ و ڕکەبەری لە نێوان سەرکردە بوەیهیەکان لە لایەك و نێوان ئەو سەرکردانە و سەربازاندا لە لایەکی ترەوە سەری هەڵدا، هەروەك ئاژاوە و فیتنە لە نێوان سەربازاندا بڵاو بوویەوە[42]. لە

---

[31] الراوندی:راحة الصدور وآية السرور در تأريخ آل سلجوق، چاپی دووەم،چاپخانەی سپهر، (تهران) ١٣٦٤)، ص١٦٣،١٦٢ " عبدالله رازی: تأريخ الكامل ايران، چاپی بيستەم، چاپخانەی اقبال، (د-م،١٣٥٨)، ص١٨٦ " محمد سهيل طقوش: تأريخ السلاجقة في البلاد الشام، ط١، دار النفائيس، (بيروت، ٢٠٠٢ز)، ص٨٦-٨٧.

[32] حسين أمين: تأريخ العراق في العصر السلجوقي، مطبعة الارشاد، (د-م، ١٩٦٥ز)، ص ١٧٨ " حسن كريم: م.س،ج٢، ١٢٦.

[33] محمد سهيل قطوش: تأريخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ٨٨.

[34] محمد سهيل قطوش: تأريخ الدولة العباسية، ص٢٣٨.

[35] ابن اثير: م.س،ج٨، ص٣٠.

[36] المقريزی: السلوك لمعرفة الدولة المملوك، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت، ١٩٩٧ز)، ج١، ص١٣٩ " ن. و پيگولوسكانيا و ئەوانی تر تأريخ ايران، ت، ر/ كريم كشاورز، چاپی چوارەم، چاپخانەی پەيام، (تهران، ١٣٥٤)، ل٢٦٨ " الصلابي: الدولة السلاجقة، ص ٤٩.

[37] ابن الوردی: تأريخ ابن الوردی، ط١، دار الكتب العلمية، (بيروت،١٩٩٦ز)، ج١، ص٣٣٨.

[38] الاصفهانی: م.س، ص١٩ " عبدالله رازی، س.ث، ل١٨٧.

[39] الاصفهانی: م.س، ص١٩.

[40] المقيرزی: م.س، ج١، ص١٣٩-١٤٠.

[41] الصدفي: الوافب بالوفيات، دار أحياء التراث، (بيروت،٢٠٠٠ز)، ج٥، ص٧٠.

[42] محمد سهيل قطوش: تأريخ الدولة العباسية، ص٢٣٩ " نيشتمان بەشير محمد: س.پ،ل١٠٢.

ئەنجامی ئەم ڕکەبەریە بنەماڵەییەدا، ئاسایش و ئارامی لە بەغدا نەما، خەلیفەی عەباسیش هەستی بەو داکەوتن و هەڵوەشانەوە کرد و پێی وابوو دەوڵەتی بوەیهی ناتوانێت کاروباری عێراق سەقامگیر بکات[43].

کاتێك سەلجوقیەکان هاتنە دەوروبەری عێراق، (ئەرسەلان بەساسیری)[44] دەستی بەسەر بەغداد و دەوروبەری دا گرتبوو، ئەو سەرکردەیە مەترسیەکی تەواوی بۆ سەر خەلافەتی عەباسی و دەوڵەتی بوەیهی دروست کردبوو، مەترسیەکەی بۆ سەر دەوڵەتی عەباسی ئەوە بوو کە لە ساڵی (٤٤٦ك/ ١٠٥٤ز) دا کاتێ ناکۆکی و ململانێ لەگەڵ خەلیفە قائیمدا سەری هەڵدا، وابەستەی و پەیوەندی خۆی بە فاتیمیەکانەوە ڕاگەیاندو، هەروەها ڕایگەیاند کە بەغداد سەر بە دەوڵەتی فاتیمیە و ناوی خەلیفەی (المستنسری فاتیمی) لەسەر مینبەرەکانی عێراق هێنا کە ئەمە پێشتر لە مێژوودا ڕووی نەدابوو، مەترسیشی بۆ سەر دەوڵەتی بوەیهی لە ململانێی لەگەڵ مەلیك ڕەحیمی بوەیهیدا خۆی نواند، ئەمەش هەڕەشەی لە قەڵەمڕەوی بوەیهی لە عێراق دا کرد[45].لەو بارە گرژ و نالەبارەدا هەریەکەیان لە بەرژەوەندی خۆی هەوڵی دەدا، خەلیفەیش متمانەی بە دەوروبەری خۆی نەمابوو، وای بەباش دەزانی پەیوەندی بەهێزی زاڵبووەوە بکات، بەتایبەت کە ئەو هێزە سەلجووقیە سوننە مەزهەب بوو، ڕێزی خەلافەتی دەگرت و هەواداری و پشتیوانی بۆ خەلافەت هەبوو، بۆیە پەنای بۆ لای سوڵتان تورغول بەگی سەلجووقی برد و داوای لێکرد دژ بە بەساسیری یارمەتی بدات.[46]

سوڵتانیش ئەو دەرفەتەی قۆستەوە و بە سوپاکانیەوە بەرەو بەغدا چوو لە ساڵی (٤٤٧ك/ ١٠٥٥ز) دا چووە ناو بەغدا و، گەڕا بەدوای بەساسیری دا تا گرتی و کوشتی، هەروەها مەلیك ڕەحیمی کۆتا سوڵتانی بوەیهی گرت و بەمەش دەوڵەتی بوەیهیەکان ڕووخا و دەوڵەتی سەلجووقیەکان شوێنیان گرتنەوە و دا مەزران. بەم جۆرە عێراق چووە ناو بازنەی قەڵەمڕەوی سەلجوقیەکان.[47]

خەلیفەش وەك سوڵتان بەسەر هەموو ناوچەکانی ژێر دەستەڵاتی خۆیدا دانی بە تورغول بەگدا نا و فەرمانی کرد لە وتاردا ناوی بهێنن[48]، هەروەها نازناوی باڵی ڕاست و فەرماندەی باوەڕداران و شای ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای لە سوڵتان تورغول بەگ نا.[49]

بەم شێوەیە تورغول بەگ بوو بە دەستەڵاتداری شەرعی سەلجوقیەکان و بوو بە خاوەنی پشکی گەورە لە سیاسەتی دەوڵەتی عەبباسیدا، لە (٤٢٩ك/٤٤٩ك) (١٠٣٧ز/١٠٥٧ز) سەلجوقیەکان توانیان لە ماوەی ئەو بیست

---

[43] محمد سهيل قطوش: تأريخ السلاجقة في البلاد الشام، ص٩٠.

[44] بەساسیری: ناوی تەواوی (ئەرسەلانی کوڕی هەبدوڵڵای ئەبو حارسی بەساسیری) یە، وەکو درانە پاڵێك بۆ شارۆچکەی (بەسا) یان وەکو عەرەبەکان پێی دەڵێن (فەسا) لە (فارسە)وە پێشەنگی تورکەکان بوو لە بەغداد، دەڵێن زووتر یەك لە مەملوکەکانی (بەهائولدەولەی بوەیهی) بووە و خەزمەتی (قائیمی) خەلیفەی عەباسی کردووە ئەویش بە پێش هەموو دوورگەکانی بەغدای خستووە، بەسەرپەرشتیاری فیتنەی گەورە ناسراوە و لە ساڵی (٤٥١ك/ ١٠٥٩ز) لە لایەن تورغول بەگەوە کوژراوە. وەرگیراوە لە: (الحسینی: م.س،ص١٨ " الذهبي: سير اعلام النبلاء، ط٣، ( بيروت، ١٩٨٦ز)، ج١٨، ص٤٨١ " نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل١٦٨).

[45] الحسینی: م.س، ص١٨، ١٩، على ابراهيم حسن: التأريخ الاسلامى العالم، مكتبة النهضة المصرية، (القاهرة، ١٩٧٢ز)، ص٤٦٠، محمد سهيل قطوش: تأريخ الدولة العباسية، ص١٣٩.

[46] الذهبی: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص١٠٩، ١١٠ " على ابراهيم حسن: م.س، ص٤٦٢ " عبدالنعيم محمد حسنين:م.س، ص١٣٨-١٣٩.

[47] سيوطي: م.س، ص١٧٩-١٨٠ " عبدالعظيم رضاي: پێشینە ئیرانیان، ج٢، تهران، د-ت، ص٦٧ " محمود شاكر: الخلفاء العثمانيون، ط١، المكتبة الاسلامى ،د-م، ٢٠٠٣ز، ص١٥ " عبدالله رازي: م.س، ص٢٠ " محمد خضرى بك: محاضرات التأريخ الاسلامية، ص٥٥.

[48] الحسيني: م.س، ص٢٠ " الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، ل٣٨ " محمد خضرى بك: چەند وانەیەك لە مێژووی دەوڵەتی ئیسلامی، ل١٤٧ " كارل بروكلمان: م.س، ص٢٧٣ " محمد سهيل طقوش: تأريخ الدولة العباسية، ص٢٤٠.

[49] حسين أمين: م.س، ص١٧٨.

ساڵەدا لە دەستەڵاتی هەرێمایەتیەوە خۆیان بکەن بە دەستەڵاتی گەورەی خاوەن بوونی هێزێکی گەورەی و پشتیوانی خەلافەت وەربگرن لە ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا[50].

# بەشی یەکەم
# سوڵتان ئەلب ئەرسەلان و وەرگرتنی دەسەڵات
## باسی یەکەم
## ژیان و کەسایەتی سوڵتان ئەلب ئەرسەلان

ناوی سوڵتانی گەورە، پاشای دادپەروەر، عەزدودەولە، ئەبوشوجاع ئەلب ئەرسەلان[51] موحەممەدی کوڕی جەغری بەگ داودی کوڕی میکائیلی کوڕی سەلجوقی کوڕی تقاقی کوڕی سەلجوقی تورکمانی غوززیە،لە گەورە پاشا ناودارەکانی ئیسلامە.[52]

سوڵتانێکی گەورەی سەلجوقیە، لەساڵی (٤٢٤ك/١٠٣٢ز) لەدایك بووە، بنەچەی دەگەڕێتەوە بۆ گوندێك پێی دەگوترێت(نور)، دووەم سوڵتانی دەوڵەتی سەلجوقیە و لەساڵی(٤٥٥-٤٦٥ك/١٠٦٣-١٠٧٣ز) فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی سەلجوقی کردووە، برازای سوڵتان توغرول بەگ بووە و دوای توغرول بەگی مامی دەستەڵاتی گرتۆتەدەست پادشایەکی دادپەروەری بەسامی قسەڕۆیشتوو بووە، یەکەمین کەس بووە لەسەر مینبەرەکانی عێراق بەناوی سوڵتان ناوی هێنرابێ.[53] خاوەنی کەسایەتیەکی بەهێزو بەتوانا بووە، ناوبانگیەکی گەورەشی هەبووە، ئەوەش چونکە درێژەی بەو سیاسەتە فراوانیخوازەدا، کە سوڵتان توغرول بەگ دەستی پێ کردبوو،لەم بوارەشدا ئەلب ئەرسەلان سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا.[54]

سنوری دەستەڵاتی دەوڵەتی سەلجوقی لە سەردەمی ئەم سوڵتانەدا فراوانیەکی گەورەی بەخۆیەوە بینی و چەند ناوچەیەکی داگیرکرد کە مامی داگیری نەکردبوون و دەستی پێ نەگەشتبوو.[55] بۆیە زۆرێك لە مێژوونووسان ستایشی سیاسەتەکەیان کردووە، لەوانە (ئیبنوخەلەکان) دەڵێت: ((دەستی بەسەر مەمالیکەکاندا گرت و شانشینەکەی گەورە بوو، هێزەکەی ترسناکتربوو، هێندەی وولاتی تریش داگیرکرد، توغرول بەگی مامی لەگەڵ فراوانی موڵکەکەیشی، هێشتا وەکو ئەمەی ئەو نەبوو)).[56]

ئەلب ئەرسەلان کەسێکی بەخشندە و دادپەروەر و ژیر بوو، دڵ نەرم و بەسۆز و میهرەبان بووە بەرامبەر بە هاووڵاتیان و هەژاران، خێرو بەخششی زۆری هەبووە، لەگەڵ کەسوکارو هاوەڵان و مەمالیکەکانی دا باش

---

[50] ابي جرادة: بغية الطلب في تاريخ حلب، دار الفكر، (دمشق، د-ت)، ج٣، ص١٣٥ " ابن خلدون: م.س، ج٤، ص٣٦٠.

[51] ئەلب ئەرسەلان: ناوێکی تورکییە و بەواتای (شێری دلێر) دێت، هەروەها عەزودەولە بەواتای (هێزی بازوی دەوڵەت) دێت، ئەبو شوجاعیش نازناوی دادپەروەرە، ئەلب ئەرسەلان ناوی بەزمانی عەرەبی دەبێتە (محمدی کوڕی داود). ئەمەش لەبەر ئەوەی کەسێکی بەهێز و ئازا و دادپەروەربوو، بۆیە ئەم نازناوەی لێنراوە. وەرگیراوەلە (الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦١).

[52] الاصفهاني: م.س، ص١٩٩ " ابن اثير: م.س، ج٨، ص٣٢ " الذهبي: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٤.

[53] الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦١.

[54] الحنبلي: شذرات الذهب في أخبار من ذهب، ط١، دارالكتب العملية، (بيروت،١٩٩٨ز)، ج٤، ص٦.

[55] نیشتمان بەشیری محمد: س.پ، ل١٩٨.

[56] وەرگیراوە لە: نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل١٩٨.

بووە.[٥٧] کەسێکی لێهاتوو و زۆر بەهێز بووە و لە کارەکانیدا دڵسۆزو چالاك بووە، بە شێوەیەکی گشتی هەڵوێستی باشی لەڕووی دوژمنانیدا نواندووەن هەڵوێستی لەگەڵ پاشای ڕۆم بەڵگەیە لەسەر ئەمە.[٥٨]

لەسەردەمی ئەودا هیچ تاوان و دەست بەسەرداگرتن بەدی ناکرێت، بەڵکو لەسەردەمی ئەودا وادانرابوو کە خەڵکی ساڵانە بەدووجار باجی سەرەکی خۆیان بدەن، ئەمەش بۆئەوەی سووك بێت لەسەریان و ناڕەحەت نەبن.[٥٩]

لەشەڕەکانیدا سەرکەوتووبووە و زۆر حەزی لە جیهادو تێکۆشان بوو بۆ سەرخستنی ئیسلام، تەواو شەیدای ڕێگەی خواو بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام بوو.[٦٠] فەرماندەی سەربازی و توانای سیاسی، هەردووکیان لە کەسایەتی ئەلب ئەرسەلان دا کۆ ببونەوە، هەروەها هەلومەرجی ئەو کاتە کەسایەتیەکی وای بۆ دروستکرد کە گەورەترین کاریگەری لە وێنە کێشانی سیاسەتی سەلجوقی دا هەبێت، ئەویش کاریگەری وەزیر (نیزا مولمولك) بوو.[٦١]

ئەلب ئەرسەلان کەسێکی نەخوێندەواربوو، بۆیە کاروبارەکانی دەدایە دەست نیزامولمولکی وەزیری، لە ژێر ڕێنموونی وەزیرەکەیدا کۆشکی ئەلب ئەرسەلان پڕ بوو لەکۆڕی زانایان و دانایان، گێڕانەوەی چیرۆك کاریگەرییان هەبووە لەسەر کەسایەتی ئەلب ئەرسەلان.[٦٢]

نووسەرێکی سەر بە دیوانی دەوڵەت سکاڵایەك لە دژی نیزامولمولك نووسی و هێنای بۆلای سوڵتان و تێیدا باسی مولك و سامانەکانی نیزامولمولکیان کردبوو لەکاتی دەستەڵاتدارییەکەیدا ئەویش بانگی نیزامولمولکی کرد و ووتی:((ئەمەی کە ووتراوە و ڕاستە ڕەوشتت پوخت بکەرەوە و حاڵی خۆت چاك بکە، ئەگەریش ئەمەی ووتراوە درۆیە لە گوناهی ئەو کەسە خۆش بەو، چاوپۆشی لە نووسەرەکەی بکە و بە پۆستێکی گرنگ لە پۆستەکانی دیوان سەرگەرمی بکە تا واز لە درۆ بهێنێ))، ئەمەش بەخشندەیی و لێبوردەیی ئەم سوڵتانەمان بۆ دەردەخات.[٦٣]

سووریش بووە لەسەر پاراستنی سامانی هاووڵاتیان، گرنگی زۆری بەوە دەدا کە سەربازان دەست بۆ ماڵ و سامانی هاووڵاتیان نەبەن، هەواڵی بیست کە هەندێ لە مەمالیکە تایبەتەکانی بەزۆر شمەك و باجی هەندێ وەدوجووتیاریان تاڵان کردووە،ئەویش مەملوکەکەی گرت و لە خاچی دا. بەمە خەڵکی نەیدەوێرا دەست بۆ ماڵی کەسی تر ببات.[٦٤]

ئەلب ئەرسەلان گوێی لە مێژوو و ئەدەبی پاشاکان و حوکمەکانی شەریعەت دەگرت، لە ناو پاشاکاندا بە ژیاننامەی چاك و پاك و پارێزگاری بەڵێنەکانی ناوی دەرکرد،[٦٥] لەبەرئەوەی ژیانپاکی و پاراستنی بەڵێنەکانی

---

[٥٧] ابن الاثیر: م.س، ج٨، ص٢٣٣ " ابن کثیر: م.س، ج١١، ص١٢٢ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٧٨.
[٥٨] دائرة المعارف الاسلامیة: (مادة ألب أرسلان)، ج٢، ص٥٠٣ " تامار تالبوت رایس: م.س، ص٣٠.
[٥٩] الذهبي: تأریخ الاسلام: ج٢، ص١٦٢ " ابن کثیر: م.س، ج١١، ص١٢٢ " الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، ل٤٥.
[٦٠] الحسیني: م.س، ص٥٤ " الذهبي: تأریخ الاسلام، ج٢، ص١٦٢ " الحنبلي: م.س، ج٤، ص٦.
[٦١] نیشتمان بشیر محمد: س.پ، ل١٩٩.
[٦٢] دائرة المعارف الاسلامیة: م.س، ج٢، ص٥٠٣ " تامارا تالبوت رایس: م.س، ص٣٠.
[٦٣] الذهبي: تأریخ الاسلام، ج٢، ص١٦٣ " ابن کثیر: م.س، ج١١، ص١٢٢.
[٦٤] ابن کثیر: م.س، ج١١.
[٦٥] ابن الاثیر: م.س، ج٨، ص٢٥٣ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٨٠.

گەیشتبوویە بەر گوێی پاشایان، بۆیە لەدوای جۆرە ڕێگرییەك ملكەچی و گوێڕایەڵی خۆیان بۆ نیشاندا لەوپەڕی ئەودیو ڕووبارەوە تا ئەوپەڕی وولاتی شام.[٦٦]

ئەلب ئەرسەلان لەماوەی فەرمانڕەوایەتی خۆیدا ماوەی نەبوو سەردانی عێراق و بەغداد بكات و نەشی بینیووە، هەرچەندە عێراق بەشێكیش بووە لە دەوڵەتەكەی، چونكە بە كێشەكانی نێوخۆی دوڵەتەكەیەوە سەرقاڵ بوو،لەم ماوەیەدا خەلیفەی عەباسی (القائم بامرالله) بوو، تێبینی دەكرێت لەماوەی فەرمانڕەوایەتی ئەلب ئەرسەلان دا ڕێزو هاوكارییەكی توندو تۆڵ لە نێوان خەلافەت و دەوڵەتی سەلجوقی دا هەبووە، پێشنارو فەرمانەكانی خەلیفە جێگای گرنگی پێدان و جێبەجێكردن بوو لەلایەن سەلجوقیەكانەوە.[٦٧]

لەساڵی(٤٦٥/١٠٧٣ز) مردووە و ماوەی ٤٠ساڵ و چەند مانگێك ژیاوەو ماوەی دەستەڵاتیشی ٩ساڵ و چەند مانگێك بووە.[٦٨] لە دوای خۆی چەند كوڕێكی بەجێهێشت لەوانە:(مەلیكشاه،تكش،ئەیاز،ئەرسەلان ئەرغون،...هتد)، مەلیكشای كوڕی كردە جێگرەوە لەدوای خۆی، لەشاری(رەی) لای گۆڕی داودی باوكی و توغرول بەگی مامی نێژراوە.[٦٩]

---

[٦٦] محمد خضري بك: چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی، ل١٤٨.

[٦٧] الحنبلي: م.س، ج٤، ص٦ " حسين أمين: م.س، ص٧٢.

[٦٨] الاصفهاني: م.س، ص٢١٣ " الحنبلي: م.س، ج٤، ص٦.

[٦٩] ابن أثير: م.س، ج٨، ص٢٣٣ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦٣ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٢٢ " سيف الدين الكاتب: م.س، ص٨٠.

# باسی دووەم

## دەرکەوتن و ڕۆڵی سوڵتان لە پێش دەستەڵاتداریداو وەرگرتنی دەستەڵات

ئەلب ئەرسەلان هەرلەتەمەنی لاوێتیدا دەرکەوت و ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی گێڕاوە لە مەیدانی سیاسی و سەربازی لەناو بنەماڵەی سەلجوقیدا، چونکە هەر لە منداڵی‌یەوە ئازایەتی و لێهاتوویی و بەهێزی خۆی دەرخستوە،[٧٠] لە زۆربەی شەڕەکانی سەردەمی توغرول بەگی مامی و جەغری بەگ داودی باوکی دا بەشداری کردووە.[٧١]

لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی باوکی‌دا، لەساڵی (٤٣٥ك/١٠٤٤ز) سەرکردایەتی سوپاکەی باوکی کرد بۆهێرش کردنەسەر سوڵتان مودودی کوڕی مەسعودی کوڕی مەحمودی کوڕی سبکتکین، سوڵتان داود کەخاوەنی خۆراسان بوو سەرکردایەتی کردنی سوپاکەی دایەدەست کوڕەکەی، ئەلب ئەرسەلانیش بە خۆی و سوپاکەیەوە هێرشی کردەسەر سوپای غەزنەویەکان و کوشتارێکی زۆری لێ کردن و سوپای غەزنەویەکانی تێك شکاند، بەم سەرکەوتنە گەورەیە سوڵتان داودی باوکی خۆشحاڵ بوو، بۆیە دوای ئەوە سەرپەرشتی (بلغ و طغیرستان و ترمذ و قبادیان وحش)ی بە ئەلب ئەرسەلان سپارد و ئەویش دەستەڵاتەکەی پتەو و بەهێز کرد.[٧٢]

لەساڵی (٤٥٠ك/١٠٥٨ز)یش توانی مامی خۆی لە ئاشوبەکەی (ئیبراهیم یەنال) ڕزگار بکات، لە٢٥ی ڕەجەبی ئەوساڵەدا سوڵتان توغرول بەگ بەرەو (نەصیبین)[٧٣] ڕۆیشت کە گەیشتە ئەوێ براکەی (ئیبراهیم یەنال) کە لە دایکیەوە برای بوو لێی جیابۆوە، لە ئەنجامی ئەوەدا سوڵتان توغرول بەگ لە نەصیبین ڕۆیشت و ڕووی کردە(هەمەدان)،[٧٤] بەڵام دەستەڵاتی لە هەمەدان بەرەو لاوازی چوو، چونکە ئیبراهیمی برای دەستەڵاتی لەو ناوچەیەدا بەهێزبوو، سوپا لەدوری ئەو کۆدەبوویەوە.

ئەوکاتە ئەلب ئەرسەلان لە سجستان بوو، تواغرول بەگ داوای یارمەتی لێکرد دژی ئیبراهیمی برای، ئەلب ئەرسلانیش سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد بۆ هاوکاری کردنی مامی، لەساڵی (٤٥٠ك/١٠٥٨ز) سوپاکانیان بەیەك گەیشتن و ئەلب ئەرسەلان ئیبراهیم یەنال دەگرێت و دەستەڵاتی بۆمامی دەگێڕێتەوە.دوای کۆتایی پێهاتنی ئەو ئاشوبە ئەلب ئەرسەلان گەڕایەوە بۆ خۆراسان.[٧٥]

لەساڵی (٤٥١ك/١٠٥٩ز)جغری بەگ داود کۆچی دوایی کرد، ئەلب ئەرسەلان بوو بە جێنشینی باوکی و فەرمانڕەوایی خۆراسان و ئەودیو ڕووباری گرتەدەست و جێگەی باوکی گرتەوە .[٧٦]

---

[٧٠] أحمد تمام: ألب أرسلان بطل ملازكرد، وەرگیراوە لە سایتی ئینتەرنێتی: http://www.islamonline.net .

[٧١] الحسيني: م.س، ص٢٧.

[٧٢] الأصفهاني: م.س، ص١٦ " الحسيني: م.س، ص٢٧.

[٧٣] نەصیبین: لەشارەکانی هەرێمی جەزیرەیە، دەکەوێتە نێوان دیجلە و فورات، ڕێگەی کاروانچیان بووە لە موسڵەوە بۆ شام، نێ‌انی لەگەڵ موسڵ شەش ڕۆژە ڕێیە، نێوانیشی لەگەڵ سنجار حەوت فەرسەخە. وەرگیراوە لە: (یاقوت: م.س، ج٥، ص٢٨٨).

[٧٤] هەمەدان: لە شارە گەورەکانی هەرێمی چیاکانە، کە دەکەوێتە ناوەڕاستی، لەسەر ڕێگەی (حەج) و کاروانیان، شەش و حەوت فەرسەخ لە حلوان دوورە کە هەر فەرسەخێك بە نزیکەی شەش کیلۆمەتر یەکسانە. وەرگیراوە لە: (نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل٣٧).

[٧٥] الحسيني: م.س، ص١٩.

[٧٦] الذهبي:سیر اعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٨ " سیوطی: م.س، ل١٨١ " کارل بروکلمان: م.س، ص٢٧٣ " محمد خضری بك: چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی.

لەی٨ ڕەمەزانی ساڵی (٤٥٥ك/١٠٦٣ز)سوڵتان توغرول بەگ لەتەمەنی ٧٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.[٧٧] دەوڵەتێکی بەهێز و بنەما چەسپاوی لەدوای خۆی بەجێ هێشت،[٧٨] چونکە هەوڵێکی زۆری دا بۆچەسپاندن و بەهێزکردنی بنەماکانی دەوڵەتەکەی، توانی سەرکەوتنێکی گەورە لەدانانی بناغەیەکی تۆکمە بۆ دەوڵەتی تازە لاوی سەلجوقی بەدەست بهێنێت،[٧٩] بەڵام بەمردنی ململانێیەکی توند کەوتە نێوان تاکەکانی خانەوادەکەی، لەپێناو ئەوەی کامیان دەستەڵات بگرنەدەست، چونکە سوڵتان توغرول بەگ هیچ کوڕێکی لەدوای خۆی جێ نەهێشتبوو، کە لەدوای خۆی جێی بگرێتەوە و میراتی تەخت وەربگرێت، بۆیە کێشەی جێگرەوەی سوڵتان و ململانێ و کێبەرکێی نێوان تاکەکانی بنەماڵەی سەلجوقی سەری هەڵدا.[٨٠]

هەچەندە توغرول (سلێمانی کوڕی جەغری بەگ داود) ی وەك جێگری خۆی دەست نیشان کردبوو، کەئەمەش لەژێر کاریگەری دایکی سلێماندابوو، کەهاوسەری توغرول بەگ بووە، چونکە هەر دوای مردنی باوکی سلێمان کە (جەغری بەگ داود) ە، توغرول بەگ دایکی مارەکردبوۆە، هەرچەندە سلێمان بچووك بوو، بەڵام لەژێر کاریگەری ژنەکەی داکردی بەجێ نشینی خۆی.[٨١]

(عمید الملیك الکیندری)[٨٢] وەزیری سوڵتان توغرول بەگ هەستا بەجێبەجێکردنی وەسیەتی گەورەی خۆی، سلێمانی خستەسەر تەختی پاشایەتی وە کردی بەسوڵتانی سەلجوقی و فەرمانیدا لە (ڕەی)[٨٣] وتار بەناوی سلێمان بخوێندرێتەوە.[٨٤]

ئەلب ئەرسەلان سوڵتانێتی برا بچووکەکەی خۆی پەسەند نەکرد، چونکە خۆی لەبرا بچووکەکەی (سلێمان) بەشیاوتر دەزانی و وای دەبینی کە شیاوترین کەسە بۆ دەست گرتن بەسەرتەختی سەلجوقیدا.[٨٥] بۆیە کاتێك هەوالچ بوون بە سوڵتانی براکەی پێ گەیشت، بڕیاریدا بەرەو (ڕەی) بڕوات، خۆی وەکوە سوڵتانی سەلجوقی ڕابگەیەنێت.[٨٦] ئەم پێداتگریەی ئەلب ئەرسەلان لەدڵی زۆرێك لە تاکەکانی خانەوادەی سەلجوقیدا دەنگی دایەوە، نیزامولمولکی وەزیری ئەلب ئەرسەلان و زۆرێك لە سەرکردەکانی لایەنگری و پاڵپشتی ئەلب ئەرسەلانیان کرد و وەکو سوڵتان بانگەوازیان بۆ کرد،بە بەڵگەی ئەوەی (سلێمان) منداڵێکی بچووکە و توانای بەڕێوە بردنی دەوڵتی نیە، خەڵیش هەواداری ئەلب ئەرسەلان بوون، بەمەش هەموو میرەکانی خانەوادەی سەلجوقی دانیان پێدانا.[٨٧]

---

[٧٧] الآصفهاني: م.س، ص١٩٨ " ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٨٣ " الحسيني: م.س، ص٢٢ " الذهبي: دول الاسلام، ط٢، (بيروت، ٢٠٠٦ز)، ج١، ص٣٩١ " الحنبلي: م.س، ج٣، ص٢٩٥.

[٧٨] ابن الجوزي: المنتظم في التأريخ الملوك و الامم، الدار الوطنية، (بغداد،١٩٩٠ز)، ج٧، ص٢٣٤.

[٧٩] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٤٦ " نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل١٩٧.

[٨٠] ابن الاثير: م.س، ج٨، ص١٨٥ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ض٤٧ " حسين أمين: م.س، ص٧١ " نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل١٩٨.

[٨١] ابن الجوزى: م.س، ج٧، ص٢٣١ " الرواندي: م.س، ص١١٦ " الذهبي: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٤ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٢ " عباس اقبال: الوزارة في عهد السلاجقة، ت.ر/ أحمد كمال الدين حلمي، مطبوعات الجامعة، (جامعة الكويت، ١٩٨٤ز)، ص٧٠.

[٨٢] عمید الملك الكندری: ناوی محمدی کوڕی منصوری کوڕی کەندەرییە، خەڵکی گوندی (کندر) ی سەر بە نەیسابورە، کەسێکی زیرەکی زمانپاراوی شاعیر بووە و لێهاتوو و ئازا و بە توانابووە و ڕەوشتی چاك و پاکی هەبووە .. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (ابن الجوزي: م.س، ج٧، ص٢٣٨-٢٣٩ " الحسيني: م.س، ص٢٣-٢٤-٢٥ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٦ " عباس اقبال م.س، ص٣٤).

[٨٣] ڕەی: یەکێکە لە شارە گەورە و بەناوبانگەکانی خوراسان، نێوانی ئەو و نەیسابور (١٩٠٠) فەرسەخە، نێوانیشی لەگەڵ قەزوین (٩٧) فەرسەخە. وەرگیراوە لە: (یاقوت: م.س، ج٣، ص١١٦).

[٨٤] الأصفهاني: م.س، ص١٩٩-٢٠٠ " ابن الاثير: م.س، ج٨، ص١٨٥ " دائرة المعارف الاسلامية: م.س، ج٢، ص٥٠٢.

[٨٥] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٤٧ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٣٥.

[٨٦] ابن كثير: م.س، ج١١، ص١١٢.

[٨٧] ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٨٥ " دائرة المعارف الاسلامية: م.س، ج٢، ص٥٠٢، حسين أمين: م.س، ص٧١ " عباس اقبال: م.س، ص٧١.

کاتێك (عمیدالملك الکیندری) زانی زۆرینە ئەلب ئەرسەلانیان دەوێت، هیچی نەدۆزیەوە جگەلە ملکەچ بوون بۆ ئەو ڕووداوەی کەڕووی دا، هەستی بەمەترسی کرد، ترسا لەوەی ئەلب ئەرسەلان لێی تورە بێت و تەماعی ئەوە گرتی کە هەندێك پلەو پایەی پێبدرێ و نزیك بێتەوە لە سوڵتان، بۆیە فەرمانیدا لە (ڕەی) وتار بە ناوی ئەلب ئەرسەلانەوە بخوێندرێتەوە،سلێمانیشی کرد بە جێگری ئەلب ئەرسەلان.[88]

بەم شێوەیە (سلێمانی کوڕی جەغری بەگ داود) لە سوڵتانێتی لابرا و فەرمانڕەوای جێگیر بوو بۆ ئەلب ئەرسەلان لە (ذی الحجة) ی ساڵی( ٤٥٥ك/١٠٦٣ز) زۆربەی ئەندامانی بنەماڵی سەلجوقی دانیان بە سوڵتانێتیەکەی دا نا.[89]

لە ساڵی (٤٥٦ك/١٠٦٤ز) دا ئەلب ئەرسەلان مۆڵەتی بە کچی خەلیفەدا کە خێزانی توغرول بەگ بوو، تا بگەڕێتەوە بۆ بەغداد و هەندێ دادوەر و سەرکردەی لەگەڵدا نارد.ئەویش لە شەودا بە ئاهەنگێکی گەورەوە بەشێوەیەکی زۆر ڕێکوپێك ڕۆیشتەوە بەغداد.[90] خەلیفە کەسوکاری بەوە دڵخۆش بوون و خەلیفە و کەسوکاری بەوە دڵخۆش بوون و خەلیفە فەرمانی کرد تا لەسەر مینبەرەکان و لە وتاردا نزا بۆ ئەلب ئەرسەلان بکرێت. لە نزاکەدا دەوترا: خوایە حاڵی سوڵتان موعەزەم عەزدودەولە و تاجولمیلە ئەلب ئەرسەلان ئەبو شوجاع موحەممەدی کوڕی داود چاك بکە.[91]

خەلیفە کۆڕێکی گشتی بۆخەڵك بەست و بەیعەتی بۆ ئەلب ئەرسەلان پێدان و لەگەڵ شەریفی نەقیبی عەباسیەکان (تەرادی کوڕی موحەممەدی زەینی و ئەبو موحەممەدی تەمیمی و موفەقی خادم) دا جل و بەرگی بۆ نارد.[92] وەزیر نیزا مولمولکیشی بە قوامودینی وە دەولە ئەمیری باوەڕداران ناوزەند کرد، پێش ئەوە پێی دەوترا: خواجە بزرك. سوڵتان ئەلب ئەرسەلانیش کۆمەڵێ دیاری و خەڵاتی گرانبەهای بۆ خەلیفە نارد و دەستەلاتی لە بەغداد و هەموو شارەکانی عێراقدا سەقامگیر بوو.[93]

ئەلب ئەرسەلان دوای ئەوەی دەستەلاتی بۆ جێگیر بوو، خۆی ئامادەکرد بۆ دانیشتن لەسەر تەختی پاشایەتی سەلجوقی لە (ڕەی) دا، بەڵام زۆری نەبرد هەر لەگەڵ سەرەتای سەردەمەکەی لە ساڵی (٤٥٦ك/١٠٦٣ز) دا مەترسیەکی گەورە ڕووبەڕووی بووەوە، ئەویش خۆی لە یاخی بوونی (شەهابولدەولە قوتولمشی کوڕی ئیسرائیلی کوڕی سەلجوق) دا، دەبینیەوە.[94]

شەهابولدەولەی قوتولمش ئامۆزای توغرول بەگ و جەغری بەگ داود بوو، سەرکەشی نواند و لە گوێڕایەڵی دەرچوو، ویستی دەستەلات لە ئەلب ئەرسەلان بستێنێ، ڕایگەیاند کە ئەو شیاوترە بۆ وەرگرتنی دەستەلات،

---

[88] الأصفهاني: م.س، ص٢٠٠ " ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٨٥ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٢ " دائرة المعارف الاسلامية: م.س، ج٢، ص٥٠٢.

[89] الراوندي: م.س، ص١١٦، الذهبي: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص١٨٥ " الحنبلي: م.س، ج٢، ص٢٩٥ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٤٨.

[90] لەو شتە نامۆیانەی مێژوو کە باس دەکرێت ئەوەیە کە تورغول بەگ بوو بە زاوای خەلیفە (قائم بأمرالله) و کچی خەلیفەی لە ساڵی (٤٥٥ك / ١٠٦٣ز) کرد بە هاوسەری خۆی، ئەمەش شتێ بوو کە هیچ پاشایەکی پێشتر نەیوێرابوو لەگەڵ ئەوپەڕی بەهێزیشدا ئیشی وا بکات. مەبەستی تورغول بەگ لەم هاوسەرگیری یە بەو هیوایە بوو کە منداڵێکی لە کچی خەلیفە هەبێت، کە ڕەوابوونی ڕەچەڵەك و هێز و توانای سەلجووقی هەبێت تا بیگەیەنێتە پایەی خەلافەت و هەردوو بنەماڵەی سەلجووقی و عەبباسی بەیەکەوە ببەستێتەوە، بەڵام تورغول بەگ لەمەدا سەرکەوتوو نەبوو، چونکە هەر لە ڕەمەزانی ئەو ساڵەدا مرد. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: (الحسيني: م.س، ص٢١-٢٢ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠١ " سيوطي: /زس، ص١٨١ " محمد خضري بك: چەند وانەیەك لە...، ل١٣١ " حسين أمين: م.س، ص٧٠-٧١).

[91] ابن الجوزي: م.س، ج٧، ص٢٣٤ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٤.

[92] الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٥ " الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٣٩١ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٤.

[93] ابن الجوزي: م.س، ج٧، ص٢٣٥.

[94] ابن كثير: م.س، ج٨، ص١٩٢ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٤٨ " كارل بروكلمان: م.س، ص٢٧٣.

ووتی پاشایەتی بە ئێمە دەگات، باوکی من لەم پێناوەدا کوژراوە وە گەورەتر لە هەمووان ئەو بوو.[95] خۆی وەکو سوڵتانی سەلجوقی ڕاگەیاند و دەستی بەسەر هەرێمی (ڕەی) دا گرت، دەرکی بە گرنگیەتی پارێزراوی و سەختی شارەکانی ئەو هەرێمە کرد، بۆیە بە باشی زانی لەوێدا بمێنێتەوە و هەر ئەوێشی کردە لانەی یاخیبوونەکەی و ئاڵای شۆرشی بەرز کردەوە.[96]

ئەلب ئەرسەلانیش سوپایەکی گەورەی بۆ کۆ کردەوە و خۆی سەرکردایەتی سوپاکەی کرد بە هاوڕێیەتی وەزیرە ناودارەکەی نیزامولمولك و بە خێرایی لە نیسابورەوە بەرەو (ڕەی) هاتن.[97]

نیزامولمولك ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی گێڕا لە دانانی نەخشەی سەرکەوتنی سەربازی بۆ سوڵتان و دڵنەوایی سوڵتانی دایەوە و پێی وت: ((ئەی پاشا مەترسە، چونکە من سەربازی شەوانەم بۆ بەکارهێناویت کە بانگەوازت بۆ دەکەن و بە نوێژ و خەڵاتەکانیان سەرت دەخەن،ئەوانیش زانایان و پیاو چاکانن)). بەوە ئەلب ئەرسەلان دڵی خۆش بوو.[98]

کاتێك قوتولمش هەواڵی گەیشتنی ئەلب ئەرسەلانی بیست، خۆی ئامادەکرد بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە، سوپاکانیان لە نزیك (ڕەی) بەیەك گەیشتن و شەڕێکی گەورەی خوێناوی لە نێوانیاندا ڕووی دا، ئەنجامی شەڕکە بە تێکشکاندنی سەپاکەی قوتولمش و سەرکەوتنی ئەلب ئەرسەلان کۆتایی هات و قوتولمشیش بە کوژراوی لە گۆڕپانی جەنگەکەدا دۆزرایەوە.[99] ژمارەیەکی زۆریش لە سەربازەکانی کوژران و ژمارەیەکیشیان بە دیل گیران، سوڵتان ویستی دیلەکان بکوژێت، چونکە دەستیان هەبوو لە ڕووخان و وێران کردنی وڵاتی (ڕەی)دا، بەڵام نیزامولمولك کە جێگەی ڕەزامەندی سوڵتان بوو، داوای لە سوڵتان کرد لێیان ببورێت و ووتی: باش نیە لە نزیکەکانمان بکوژین و ناپیرۆزە و دەوڵەت زوو دوژمن پەیدا دەکات، لەبەرئەوە سوڵتان هەموویانی ئازادکرد.[100] ئیتر دەستەڵات هەر بۆ سوڵتان مایەوە، کێشەی وەرگرتنی دەستەڵات کۆتایی پێهات و فەرمانڕەوایی بۆ ئەلب ئەرسەلان جێگیر بوو.[101]

دوای تەواوبوونی ململانێ لەسەر دەستەڵات و بوون بە سوڵتان، زۆری نەبرد لە ئاسۆی سەلجوقیەکانەوە ململانێیەکی نوێ سەری هەڵدا، ئەویش ململانێی نێوان نیزامولمولك و عمیدالملك الکیندری بوو لەسەر کورسی وەزارەت. ئەمەش هەر لەساڵی (٤٥٦ك/١٠٦٤ز) دا بوو.[102]

نیزامولمولك بەهۆی زیرەکی و لێزانی خۆیەوە توانی کاربکاتە سەر سوڵتان و هانی دا دژی عمیدالملك، وایکرد کە عمیدالملکی وەزیری توغرول بەگ لەلایەن سوڵتانی نوێوە بەند بکرێت و پاشان دوای ساڵێك بەند کردنی لە (٤٥٧ك/١٠٦٥ز) کوشتی.[103]

---

[95] الأصفهاني: م.س، ص٢٠٠ " الحسيني: م.س، ص٣٠ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٣ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٧٨ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٣٥ " محمود بن محمد اقسرائي: تأريخ السلاجقة، چاپی دووەم، چاپخانەی رشديه، (د-م،١٣٦٢)، ص١٥-١٦.

[96] عبدالله رازى: م.س، ص١٩٠ " نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل١٩٨ " أحمد تمام: س.پ .

[97] ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٩٢ " الحسيني: م.س، ص٣٠.

[98] ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٣ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٧٨.

[99] ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٩٣ " الحسيني: م.س، ص٣٢ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٥ " الحنبلي: م.س، ج٢، ص٣٠١.

[100] ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٩٣ " الحسيني: م.س، ص٣٢ " محمود بن محمد اقسرائي: م.س، ص١٦.

[101] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٤٨ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٣٦ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٧٩.

[102] الراوندی: م.س، ص١١٧.

[103] ابن الجوزي: م.س، ج٧، ص٢٣٤ " الأصفهاني: م.س، ص٢٠٠ " الراوندي: م.س، ص١١٧ " الحسيني: م.س، ص٢٤-٢٥ " ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٨٨ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٤ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٦ " الحنبلي: م.س، ج٢، ص٣٠١ " عبدالعظيم رضاي: م.س، ص٦٧٠ " عبدالله رازي: م.س، ص١٩٠.

بەم شێوەیە کورسی وەزارەت بۆ نیزامولمولك بەجێماو دڵنیا بوو لە جێگیربوونی وەك وەزیر، هەروەك چۆن سوڵتانێتی جێگیربوو بۆ ئەلب ئەرسەلان.[١٠٤]

سوڵتان لە وەزارەتدا پشتی بە نیزامولمولك بەست، ئەو وەزیرێکی ڕاستگۆ و سیاسەتمەدارێکی کارامە و لێهاتوو بوو، ڕێزی هەژاران و زانایانی دەگرت.[١٠٥] ئیتر نیزامولمولك وەك تاکە وەزیری ئەلب ئەرسەلان کەوتە مەیدان، ئەو کارانەی عمیدالملك پێی هەستابوو هەمووی هەڵوەشاندەوە و پشتیوانی لە عەقیدەی (ئەشعەری) و مەزهەبی (شافعی) کرد.[١٠٦]

دوای کۆتایی هاتنی ململانێ و جێگیربوونی دەستەڵات ئەلب ئەرسەلان و وەزیرەکەی نیزامولمولك دەستیان کرد بە بنیاتنانی دەوڵەت لەسەر ئەو بنەمایەی کە توغرول بەگ دایمەزراندبوو لە ئێران و عێراقدا.[١٠٧]

ئەلب ئەرسەلان وەك توغرول بەگی مامی سەرکردەیەکی لێهاتووی بە هەڵمەت بوو، وەزیرەکەشی پیاوێکی دانا و سیاسەتمەدار و دووربین و بیر تیژ بوو، هەردووکیان پێکەوە نەخشەی کاری سیای و سەربازییان کێشا، ئەوەیان هەڵبژارد کە پێویستە پەلامار و دەستەڵاتی سەلجوقیەکان تەنها لە سنووری جیهانی ئیسلامیدا کورت نەبێتەوە، بەڵکو پێویستە هەنگاو بنێن بۆ ناوچە مەسیحیە دراوسێکانی ئێران وەك وولاتی ئەرمەن و ڕۆم، بەم کارەشیان مۆرکێکی ئاینی بۆ شەڕەکانیان لە داهاتوودا بەدەست دێنن،دەبێتە شێوەیەك لە کۆشش و جیهادکردن لە پێناوی خوادا بۆ سەرخستنی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی لە وولاتانی تردا.[١٠٨]

کاتێك ئەلب ئەرسەلان خەریکی خۆ ئامادەکردم بوو، دەیویست چالاکی بەم ئاراستەیەدا ببات لەپڕ تووشی ئاشوبێکی تری نوێ هات، ئەمەش بووە هۆی دواخستنی کارەکانی دەرەوەی تاماوەیەك، ئەویش ئەو ئاشوبە بوو کە (بیخوا) ی مامی ڕابەرایەتی دەکرد.[١٠٩] (بیخوای کوڕی میکائیل) کە حاکم و فەرمانڕەوای (هەرات)[١١٠] بوو لە دڵی گران بوو شوێنکەوتە و پاشکۆی برازاکەی بێت، ئیتر هەڵگەڕانەوەی ڕاگەیاند و لە گوێڕایەڵی ئەلب ئەرسەلان دەرچوو. داوای سەربەخۆیی دەکرد لەو شوێنانەی لەژێر دەستەڵاتیدا بوون.[١١١]

بۆیە ئەلب ئەرسەلان دەرکی بەوە کرد کە دەبێت سەرەتا پایەکانی دەوڵەت بچەسپێنێ لەژێر فەرمانڕەوایی خۆیدا بە تەمێ کردنی بەرهەڵستکاران و چەسپاندنی پایەی سوڵتان بە هەموو لایەکی دەوڵەت دا.ئینجا ڕووبکاتە ئامانجە دەرەکیەکانی لەکاتێدا دڵنیا و بێ خەمە لەلایەنی ناوخۆوە.[١١٢]

بۆ ئەم مەبەستە سوڵتان سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد و ڕووی کردە (هەرات) و کەوتە جەنگ لەگەڵ مامیدا دوای گەمارۆدانێکی توند، توانی شکست بە مامی بهێنێ و دەستی بەسەر (هەرات) دا گرت، دوای گرتنی ڕێزی مامی گرت و سزای نەدا و پەیمانی لێ سەند کە گوێڕایەڵی بێت و لە فەرمانی دەرنەچێت.[١١٣]

---

[١٠٤] الرواندي: م.س، ص١١٧ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٠.

[١٠٥] .

[١٠٦] الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٤ " الحنبلي: م.س، ج٢، ص٢٩٥.

[١٠٧] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥١ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٣٦.

[١٠٨] ن.م، ص٥١ " ن.م، ص١٣٦.

[١٠٩] ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٩١.

[١١٠] هەرات: شارێکی گەورە و بەناوبانگی خوراسانە و بە دایکی شارەکانی خوراسان دەژمێرێت، یاقوت دەڵێت: شارێکی گەورە و چاکی وەکو ئەم شارەم نەبینیوە و ژمارەی دانیشتوانی زۆرە. (معجم البلدان، ج٥، ص٣٩٦).

[١١١] ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٩١ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٤.

[١١٢] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٢ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٣٦.

[١١٣] ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٩١ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٤ " الحنبلي: م.س، ج٢، ص٢٩٦.

هەروەها بەرپرسی (ختلان) یش سەرکەشی نواند، سوڵتانیش هێرشی بردەسەری و لەگەڵیدا جەنگا و هەڵگەڕانەوەکەی ئەویشی سەرکوت کرد و دەستی بەسەر ناوچەکەدا گرت.[١١٤] لەوێشەوە ڕووی کردە (صخانیان)[١١٥]، چونکە بەرپرسی (صخانیان) یش کە ناوی (موسی) بوو ئەویش سەرکەشی نواندبوو، دەیەویست لە دەستەڵاتی سوڵتان بچێتە دەرەوە، هەر کە ئەلب ئەرسەلان نزیك بوویەوە، موسی چووە ناو قەڵایەك لە بەرزایی شاخێکدا، سوڵتانیش بە دوایدا چوو، نەگەیشتە نیوەڕۆ چووە سەرشاخەکە و قەڵاکەی گرت.[١١٦]

هەر لەساڵی (٤٥٦ك/١٠٦٤ز) دا سوڵتان ئەلب ئەرسەلان هەواڵی بۆ هات (قاورد)ی برای کە بەرپرسی (کرمان)[١١٧] بوو، دەیەوێت لە دەستەڵاتی دەربچێت، بۆیە زوو گەڕایەوە بۆ (ئەصفەهان) و لەوێوە چوو بۆ کرمان، هەرکە قاورد ئەمەی بیست گوێڕایەڵی خۆی بۆ سوڵتان ڕاگەیاند.[١١٨]

بەم شێوەیە هەموو میرەکان ئەوانەی جێی ترسی هەڵگەڕانەوە و بەرهەڵستکاری بوون سەرکوتی کردن و ئاسایش و ئارامی گێڕایەوە باری جارانی لە خۆراسان و ئەو دیو ڕووبار، دواتر گەڕایەوە بۆ نەیسابوور.[١١٩]

کاتێك دڵنیا بوو کە ئاسایشی بەدیهێناوە و حوکمی بۆ سەلجوقیەکان لە هەموو هەرێم و شارەکانی ژێر دەستەڵاتیان سەقامگیر و چەسپاوە ئەوکات پلانی دانا تا ئامانجە دوورەکانی بەدی بهێنێت.[١٢٠]

ئەلب ئەرسەلان کارێکی تریش کە پێویست بوو بیکات پێش ئەوەی هەنگاو بنێت بۆ هێنانەدی ئامانجە دوورەکانی بریتی بوو لە دۆستایەتی کردن و ڕێککەوتن لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی غەزنەوی و دەوڵەتی خانی، کە هاوسنووربوون لەگەڵ ئەو دوو دەوڵەتە، هەروەها پاشماوەی دەوڵەتی گەورە بوون و تا ئەو کاتەیش هێزیان تێدا مابوو، غەزنەوی لە غەزنەبوو، دەوڵەتی خانیش لەودیو ڕووبار بوون، جا ئەلب ئەرسەلان و وەزیرەکەی نیزامولمولك وایان بەباش زانی کە چاکترین ڕێگا بۆ یەکەوە بەستنی سەلجوقیەکان بە غەزنەوی و خانیەکان ڕێگای ژن و ژنخوازی یە.[١٢١]

ئەوەبوو کچی بەرپرسی خانیەکان خاوەنی ئەودیو ڕووباری بۆ مەلیکشای کوڕی هێنا، کچی بەرپرسی غەزنەشی لە کوڕەکەی تری (ئەرسەلان ئەرغون ) مارەکرد. بەم شێوەیە خانەوادەی سەلجوقی و غەزنەوی و سەلجوقی و خانیەکان کۆ بوونەوە.[١٢٢]

دوای ئەوە ڕووی دەستەڵاتیان وەرچەرخاند بۆ جێبەجێکردن و بەدەستهێنانی مەبەست و ئامانجە گەورەکانیان.

---

[١١٤] ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٩٠ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٤.

[١١٥] صخانیان: ویلایەتێکی گەورەی سەر بە وڵاتی ئەودیو ڕووبارە، پەیوەندی بە ناوچەی ترمزەوە هەیە. وەرگیراوە لە: (یاقوت: م.س، ج٣، ص٤٠٨).

[١١٦] ابن الأثير: م.س، ج٨، ص١٩١ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٤.

[١١٧] کرمان ویلایەتێکی گەورە و بەناوبانگ و بەرفراوانە، دەکەوێتە نێوان فارس و مکران و سجستان و خوراسان. وەرگیراوە لە: (یاقوت: م.س، ج٣، ٤٥٤).

[١١٨] الأصفهاني: م.س، ص٢٠١ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٦ " دائرة المعارف الاسلامية: م.س، ج٢، ص٥٠٣.

[١١٩] " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٣٩.

[١٢٠] الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، ل٤٠.

[١٢١] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٣.

[١٢٢] ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٤ " الحنبلي: م.س، ج٢، ص٢٩٧ " دائرة المعارف الاسلامية: م.س، ج٢، ص٥٠٢.

# بەشی دووەم

# سەردەمی دەستەڵاتی سوڵتان ئەلب ئەرسەلان

## باسی یەکەم

## کارە فراوان خوازییەکانی

ئەلب ئەرسەلان وەك توغرول بەگی سەرکردەیەکی لێهاتوو پیشڕەو بوو، سیاسەتێکی تایبەتیشی گرتە بەر کە پشتی دەبەست بە جێگیر کردنی پایەکانی فەرمانڕەواییەکەی لەووڵاتانەی کە ملکەچی دەستەڵاتی سەلجووقییەکانن لە پێش ئەوەی هەنگاو بنێت بۆ ملکەچ کردنی هەرێمی نوێ و بیداتە پاڵ دەوڵەتەکەی. هەروەك شەیدای جیهادی ڕێگەی خودا و بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ئیسلام بوو، لەناو دەوڵەتی مەسیحی دراوسێدا، وەك وڵاتی ئەرمەن و ڕۆم. گیانی جیهادی ئیسلامی بزوێنەری ئەو بزوتنەوە ڕزگاریخوازانە بوو کە ئەلب ئەرسەلان پێی هەڵدەستا و مۆرکێکی ئایینی لەخۆ گرتبوو، کە بووە سەرکردەی سەلجووقیەکان وەك سەرکردەیەکی جیهادی. سووریش بوو لەسەر سەرخستنی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی بەو وڵاتانەدا و بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام بەسەر ناوچەیەکی زۆری زەویەکانی دەوڵەتی بێزەنتی دا.[١٢٣]

سوڵتان حەوت ساڵ بەناو بەشە بەرش و بڵاوەکانی دەوڵەتەکەیدا گەڕا پێش ئەوەی هیچ فراوانخوازییەکی دەرەکی ئەنجام بدات. کاتێ دڵنیا بوو کە ئاسایشی بەدی هێناوە و حوکمی سەلجووقی یەکان لە هەموو هەرێم و شارەکانی ژێر دەستەڵاتیاندا سەقامگیر وچەسپاوە، ئەوکات پلانی دانا تا ئامانجە دوورەکانی بەدی بهێنێت.[١٢٤] ئامانجە دوورەکانیشی ڕزگار کردنی وڵاتە مەسیحیە دراوسێکانیەتی بۆ دەوڵەتەکەی خۆی و خستنی خەلافەتی فاتیحی (عەبیدی) لە میسر ویەکخستنی جیهانی ئیسلامی لەژێر ئاڵای خەلافەتی عەبباسی سوننی و دەستەڵاتی سەلجوقیەکاندا.[١٢٥] ئامانجیشی لەم فراوانکاریەی ڕووەو بیزەنتیەکان، بێ هێزکردنی هێزەکانیان و دەستبەسەردا گرتنی موڵك و سامانیان بوو، هەروەها پایە و شەوکەت شکاندنی ئەم دەوڵەتە کە لە ئایندەدا دەبێتە مەترسی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی. بەم بزوتنە سەربازییانەی سەلجووقیەکان لە ژێر ئاڵای جیهاددا و چوونە ناو سنوورەکانی بیزەنتیەکان، توانیان سۆز و پشتیوانی جیهادی ئیسلامی بۆ خۆیان بەدەست بهێنن.[١٢٦]

ئەلب ئەرسەلان بۆ ئەم مەبەستانە و بۆ هێنانە دی خەونەکانی دەستی کرد بە کارە فراوانخوازییەکانی، کە لە کارە فراوانخوازییەکانیشی بریتین لە:

---

[١٢٣] حسين أمين: العراق فى العصر السلجوقى، ص ٢٤٩ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص ٧٩.

[١٢٤] عبدالنعيم محمد حسينين: م.س، ص ٥٥ " الصلابي: دولة السجقة/ ص ٨٠ .

[١٢٥] محمد سهيل طقوش: تأريخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ١١٣.

[١٢٦] حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، ص ٢٤٩.

## تەوەرەی یەکەم

## هەڵمەتی ئەلب ئەرسەلان بۆ سەر شام و گرتنەخۆی حەلەب:

ئەلب ئەرسەلان سوپایەکی گەورەی ئامادە کرد بۆ هێرش کردنە سەر وڵاتی شام، ئامانجی لە داگیرکردنی وڵاتی شام دا بریتی بوو لە فراوانکردنی دەوڵەت و چەق بەستن لە شام و ڕێگرتن لەوەی هێزە بێزەنتییەکان دەستی بەسەردا بگرن و دەرکردنی فاتمیەکان لە وڵاتی شام و شوێنگرتنەوەیان و دواتر پاککردنەوەی میسر لێیان.[١٢٧]

ئەلب ئەرسەلان چاوەڕێی هەڵکەوتنی دەرفەتێکی دەکرد تا خەونی خۆی بەدی بهێنێت، ئەو ململانێیەی لە نێوان پایەکانی فەرمانڕەوای میسردا لەپێناو دەستەڵاتداریی و دەستگرتن بەسەر (موستەنسیری فاتمیدا) ڕوویدا ئەو ئەو هەلەی بۆ سوڵتان ڕەخساند.[١٢٨]

ناسر دەولەحسین کوڕی حسنی حمدانیە یەکێ لە دیارترین سەرکردەکانی قاهیرە بوو، ئەبو جەعفەر محمدی کوڕی بوخاری دادوەری حەلەبی کردە نوێنەری خۆی و بۆ لای سوڵتانی سەلجووقی نارد تا سوپایەك بنێرێت بۆ میسر تا لە بەدیهێنانی ئامانجەکەیدا یارمەتی بدات، ئەمەش لە ساڵی (٤٦٣ك / ١٠٧١ز) دا بوو.[١٢٩]

ئەلب ئەرسەلان هەر کە بانگەوازەکەی پێگەیشت، یەکسەر سوپایەکی گەورەی ئامادە کرد بە سەرکردایەتی خۆی لە خۆراسانەوە بەرەو وڵاتی شام چوو،[١٣٠] پاشان درێژەی بە کشانەکەی بۆ میسر دا تا دەوڵەت فاتیمی بڕوخێنێ و بیداتە پاڵ دەستەڵاتی سەلجوقی، بەڵام بە هێواشیی کارەکە جێبەجێ بوو، بە هۆی ئەو بەربەستانەی کە هاتنە ڕێی لە (ڕەها) کە لە ژێر دەستەڵاتی بیزەنتیدا بوو.[١٣١]

ئەلب ئەرسەلان لە (ڕەها) دا دەبەزێ و گەمارۆی دەدا.[١٣٢] بەڵام ڕەهاییەکان بە نەبەردی بە سەرکردایەتی (باسیلی کوڕی ئەسار) کە ئیمپراتۆری بیزەنتی وەك فەرمانڕەوای شارەکە دەستنیشانی کردبوو، بەرەنگاری گەمارۆکە بوونەوە، سەلجوقیەکان درەختەکانیان بڕی و خەندەقەکانی کەنار شوراکانی ڕۆژهەڵاتیان پڕکردەوە تا لێیان بپەڕنەوە و لە دوای ٣٣ ڕۆژ گەمارۆی بەردەوام لەگەڵ دانیشتوانەکەی گفتوگۆ بکات و ڕێکبکەوێت.[١٣٣]

پاشان درێژەی بە فراوانخوازیەکانی دا بەرەو حەلەب، تاوەکو ڕێگە لەهەر هەوڵێکی دانە پاڵ بیزەنتیەکان لەبەرەی باشوورەوە بگرێت، لە ساڵی ٤٦٣ك / ١٠٧١ز لە ڕووباری فورات پەڕیەوە و چووە ناو زەویەکانی میرنشینەکە و هەموو سەرکردەکانی جەزیرە گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆیان پێشکەش کرد، وەك: (شەرەفودەلە موسلیمی کوڕی قورەیشی ئەمیری موسڵ، نەسری کوڕی مەڕوانی ئەمیری میافارقین، و ثابی ئەمیری حەران) وێڕای سەرکردەکانی تورك و دەیلەم.[١٣٤]

بەڵام محمدی کوڕی نەسری مرداسی ئەمیری حەلەب یاخی بوو، بۆیە دادوەر ئەبوجەعفەر محمدی کوڕی بخاری ناردی بۆ لای و بانگی کرد تا بچێت بۆلای سوڵتان و ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆی وەك هەموو

---

[١٢٧] عبدالنعیم محمد حسنین: م.س ، ص ٥٥.

[١٢٨] محمد سهیل طقوش: تأریخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ١١٣.

[١٢٩] ابن الاثیر: م.س ، ص٢٢٢ " الذهبي: سیراعلام النبلاء، ص ٤١٧.

[١٣٠] الزهبی: سیر اعلام النبلاو، ج١٨، ص٤١٧ " الزهبی: دول الاسلام/ ج١، ص٣٩٦.

[١٣١] محمد سهیل طقوش: تأریخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ١١٤.

[١٣٢] عمادالدین الأصفهاني: م.س ، ص ٢٠٦ " الذهبي: دول الاسلام، ج١ ص٣٩٦.

[١٣٣] محمد سهیل طقوش: تأریخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ١١٤.

[١٣٤] الصلابي: دولة السلاجقة/ ص ٨٢.

سەرکردەکانی جەزیرە بخاتە ڕوو،[135] بەڵام محمود بەربەچی بانگەوازەکەی دایەوە و پشتی بە حەلەب بەست و کەوتە بەرگری لێکردن و پیاوانی لە هەموو بەشەکانی وڵاتی شامەوە بانگ کرد و خۆی ئامادە کرد بۆ بەرەنگاری ئەو گەمارۆیەی کە ماوەیەکی دی سوپای سەلجووقی بەسەر شارەکەدا دەیسەپێنێت.[136]

ئەلب ئەرسەلان شاڵاوی بردە سەر شام و گەمارۆی دەوڵەتی مرداسیەی لە حەلەب دا، کە سالحی کوڕی مرداس لە ساڵی ٤١٤ك ئەو دەوڵەتەی لەسەر مەزهەبی شیعە دامەزراند، ئینجا (فونەیدق)[137] ی کردە مەڵبەندی سەرکردایەتی خۆی، گەمارۆکە ماوەی دوو مانگ و دوو ڕۆژ بەردەوام بوو جگە لە یەك ڕۆژ هیچ شەڕێ ڕوویینەدا.[138]

هەرچۆنێ بێت، سوڵتان نەیتوانی شارەکە بڕوخێنێ، پێدەچێ هۆکاری ئەوەش بەهێزیی بەرگری و سەختی و پتەوی شورەکان و بەشداری هەموو هۆزە عەرەبەکان بێت لەگەڵ محمود لەبەرگری لێکردنیدا، ەمە وێڕای سروشتی پێکهاتەی سوپای سەلجووقی کە پشتی بە سواری سوك دەبەست، دیاریشە کە چالاکی گەمارۆدان پێویستی بە پیادە هەیە، بەڵام سوپای سەلجووقی نەیبووە دانووستانەکان لە ماوەی ڕۆژەکانی گەمارۆ داندا نەوەستان تا بگەنە چارەسەرێك بە هۆی ڕەقی و توندی هەڵوێستەکانەوە. لە کۆتاییدا سوڵتان ناچار بوو گەمارۆی شارەکە هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام ترسا ئەگەر نەیتوانی (ڕەها) شکست پێبێنێ و حەلەبی گرتە بەر، شان و شکۆ و ناوبانگی نەمێنێ و لەکەدار ببێ، ئەمەش بە خراپی ڕەنگی دایەوە بۆ سەر دەوڵەتە تازە پێگەیشتووەکەی بە تایبەت کە هەواڵی دەرکەوتنی ئیمپراتوری بیزەنتی (ڕۆمانوسی چوارەم دیوجینوس) لە ئەرمینیا گەیشتە سوڵتان کە ئیمپراتۆر نیازی هەبوو هێرش بکاتە خوراسان.[139]

بۆیە سوڵتان پەنای بۆ سیاسەتی جیاکردنەوەی کیلابیەکان و لاواز کردنی هەڵوێستی محمودی کوڕی نەسر برد و هەموو سەرکردەکانی بەنی کیلابی بانگ کرد تا ئەمیرێکیان هەڵبژێرێتو بیکاتە بەرپرسی حەلەب و لە هەوڵی دەستگرتن بەسەر شارەکە و سەندنەوەی لە دەستی محمودی کوڕی نەسردا ڕاوێژی پێبکات، بە مەرجێ ئەو یەکلا بێتەوە بۆ هێرش کردنە سەر مەترسی بیزەنتی.[140]

سەرکردەکانیش چوون بەدەم بانگەوازەکەی سوڵتانەوە و بەگوێیان کرد، ئەوەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەناو خێڵە کیلابیەکاندا باو بووە و محمود نەیتوانیوە هۆزەکان لەژێر ئاڵای خۆیدا کۆبکاتەوە.[141]

کاتێ محمود بەو گۆڕانەی زانی لە دەستەڵاتی خۆی لە حەلەب ترسا بەتایبەت شارەکە ئامادەی ڕزگار کردن بوو، بۆیە بەپەلە ڕۆیشت بۆ لای سوڵتان و هەوڵیدا لەگەڵیدا ڕێك کەوتنێ ببەستێ تا دەستەڵاتەکەی بپارێزێ و هەڵی سەرکردە کیلابیە نەیارەکانی نەهێڵێ.[142]

هەرچۆنێك بێت محمودی کوڕی نەسر لە شەوی یەکەمی شەعبانی ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧١ز) و بە هاودەمی دایکی (مەنیعەی کچی و ثابی نومەیری) و و بە جلوبەرگی تورکەکان و بەشاراوەیی ڕۆشتن بەرەو سەربازگەی سوڵتان، سوڵتانیش پێشوازی لێکردن و ڕێزێکی زۆری گرتن و ڕەزامەندی لەسەر مانەوەی محمود وەك ئەمیری

---

[135] الذهبی: سیر اعلام النبلاء/ ج١، ص ٤١٧.

[136] محمد سهیل طقوش: تأریخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ١١٥.

[137] فونەیدق: لە ناوچەکانی حەلەبە و ئەمڕۆ بە گردی سوڵتان ناسراوە، نێوانی ئەو نێوانی حەلەب ە فەرسەخە. وەرگیراوە لە: (یاقوت: م.س، ج٤، ص٢٧٨).

[138] محمد سهیل طقوش: تأریخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ١١٥.

[139] محمد سهیل طقوش: تأریخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ١١٥.

[140] ن.م ، ص ١١٥

[141] الصلابی: دولە السلاجقە، ص٨٣.

[142] ن.م ، ص٨٤.

حەلەب دەربڕی، بەمەرجێ شوێنکەوتەی سوڵتان بێت و بانگەواز بۆ خەلیفەی عەبباسی و سوڵتانی سەلجووقی بکات.[١٤٣] بەو پێیە محمود بوو بە شوێنکەوتەی ڕەسمی و کرداری سوڵتان، حەلەبیش دەداتەوە دەست خۆی.[١٤٤]

دوای ئەوە سوڵتان ناوچەکەی بەجێهێشت و گەڕایەوە بۆ وڵاتی ئەودیو ڕووبار تا لەوێ بجەنگێ، هەندێ سەربازگە و شوێنکەوتەی خۆیشی بەسەرکردایەکتی (ئوتسوزی کوڕی ئوقی خورزمی) بەجێهێشت.[١٤٥]

تورکەکان بە سەرکردایەتی ئوتسوز لە دوای چوونی ئەلب سوڵتان ئەلب ئەرسەلان لە ناوچەکە بەرەو دیمەشق چوون بەو ئامانجەی بیگرنە خۆ، بۆیە گەمارۆیەکی توندیان خستە سەر و شالاویان بردە سەر ناوچەکانی و (میرە) یان لێدا پڕکرد و بۆ خۆیان بەکاریان هێنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی شکستی پێ بهێنن و بیگرن.[١٤٦]

بۆیە بەرەو فەلەستین بەجێیان هێشت و (ڕەملە و بەیتولمەقدیسیان) لەدوای گەمارۆیەك گرتەخۆ و پارێزگەی فاتیمیان لێ ڕاوەدوونا،[١٤٧] ئینجا (تەبەریە) یان لەدەستی فاتیمیەکان سەندەوە و گەمارۆی (یافا) یان دا فەرمانڕەواکەی (زینودەولەی فاتیمی) ڕایکرد.[١٤٨]

ئوتسوز بانگەوازی بۆ مونتەسیری فاتیمی هەڵوەشاندەوە و وتاری بۆ خەلیفەی عەبباسی و سوڵتانی سەلجووقی خوێندەوە و هەواڵی بۆ بەغداد نارد تا هەواڵی ئەو سەرکەوتنانە بگەیەنێ کە لە وڵاتی شامدا بەدیهاتووە.[١٤٩]

لە ساڵی (٤٦٢ك / ١٠٧٠ز) دا نێردراوی گەورەی مەککە (محمدی کوڕی ئەبو هاشم) هاتە لای سوڵتان و هەواڵی ئەوەی پێدا کە وتار بەناوی خەلیفە (قائم بأمر الله) و سوڵتان دەخوێننەوە، لابردنی وتاری عەبیدی لە میسر و (حی علی الخیر العمل) پەیڕەو دەکەن. سوڵتان ئەلب ئەرسەلانیش لە بەرامبەردا (٣٠) هەزار دیناری پێدا و ساڵانەش (١٠) هەزار دیناری بۆ بڕیەوە، پاشان سوڵتان بە ئەمیری مەککەی وت ئەگەر مەدینەش وا بکات، (٢٠) هەزار دینار بەویش دەدەین.[١٥٠]

هۆکاری ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لەم ساڵەدا گرانیەکی بێ هاوتا و قات و قڕیەکی سەخت ڕووی کردە وڵاتی میسر.[١٥١]

لە گێڕانەوەیەکدا هاتووە: ژنێك لە قاهیرە مشتێ کاڵای جەوهەری پێبوو هاواری دەکرد کێ دەیەوێ بە مشتێ گەنم؟ کەس لای لێ نەدەکردەوە.[١٥٢]

بەم شێوەیە ئەلب ئەرسەلان حەلەبی گرت و کۆتایشی بە کشانی دەوڵەتی فاتیمی هێنا لەم ناوچەیەدا و مەککە و مەدینەشی ڕزگار کرد لە دەستان، ناوی خەلیفەی فاتیمی (المستنصر بالله) یش لە وتاردا لادا. پێشی وابوو دەتوانێ دەوڵەتی فاتیمی لە میسردا بڕوخێنێ، بەڵام بۆ پاراستنی خوێنی موسوڵمانان کشانەکانی خۆی

---

[١٤٣] الأصفهاني: م.س، ص٢٠٦ " ابن الأثير: م.س، ج٨، ص٢٢٢ " الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٣٧٩ " الذهبي: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٧، ابن اثير: م.س، ج١١، ص١١٦ " الحنبلي:م.س، ج٤، ص٥.

[١٤٤] ن.م، ص٢٠٦ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦٢.

[١٤٥] محمد سهيل طقوش: تأريخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ١١٦.

[١٤٦] الصلابي: دولة السلاجقة، ص ٨٥.

[١٤٧] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٥ " حسين أمين: العراق فى العصر السلجوقى، ص٢٤٩.

[١٤٨] محمد سهيل طقوش: تأريخ السلاجقة في البلاد الشام، ص ١١٩.

[١٤٩] الصلابي: دولة السلاجقة، ص ٥٦.

[١٥٠] ابن اثير: م.س، ج٨، ص٢١٨ " ابن كثير: م.س، ج١٤ " سيوطي:م.س، ل١٨٢.

[١٥١] ابن جوزي: م.س، ج٧، ص٢٥٦ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١١٣ " سيوطي: م.س، ل١٨٢.

[١٥٢] سيوطي: م.س، ل١٨٢.

لە جیهانی ئیسلامیدا ڕاگرت و بە هێزەکانیەوە بەرەو ڕۆژئاوا چوو بە هەوڵی ئەوەی (ئەرمەنیا)[١٥٣] و وڵاتی کەرەج[١٥٤] ڕزگار بکات.[١٥٥]

# تەوەری دووەم

## شەڕی مەلازگرد[١٥٦] لە ساڵی (٤٦٣ك / ١٠٧١ز) دا

ئەلب ئەرسەلان هێرشە گەورەکەی دژ بە هەرێمە نەسانیەکانی دراوسێی سنووری دەوڵەتەکەی دەست پێ کرد و خۆی سەرکردایەتی سوپاکەی بەرەو زەویەکانی دەوڵەتی بیزەنتی کرد و لەگەڵ سەربازەکانی لە (ڕەی) یەوە بەرەو زەویەکانی باشووری (ئازەربایجان)[١٥٧] هات و ئینجا بەرەو ڕۆژئاوا چوو تا وڵاتی (کەرەج) و ئەو ناوچانەی درێژ کراوەی وڵاتی بیزەنتین داگیر بکات.[١٥٨] دانیشتوانی (کەرەج) زۆر شاڵاویان دەبردە سەر ئازەربایجان و ببوون بە سەرچاوەیەکی دڵەڕاوکێی ناوچەکە.[١٥٩]

سوڵتان لە درێژەی کشانەکەیدا گەیشتە نێو شاری (مەرەند)[١٦٠]، کاتێك سوڵتان لەو شارە بوو، لەوێ یەکێ لە سەرکردە تورکمانەکان کە ناوی (تەغتکین یان تەغدکین) بوو، کە جیهادی بەردەوامی دژ بە ڕۆمەکان هەبوو، بۆ پاراستنی ناوچە سنووریەکانی لە هەڕەشەی بیزەنتیەکان هاتە لای سوڵتان و داوای لێکرد بێت بۆ وڵاتەکەی.[١٦١]

سوپای سەلجووقی لە ڕێگەی دا بۆ وڵاتی کەرەج ڕووباری (ڕەس)[١٦٢]ی تێپەڕاند.[١٦٣]

ئەلب ئەرسەلان لەکاتی کشانەکەیدا هێزێکی سەربازی گەورەی بە سەرکردایەتی مەلیکشاهی کوڕی لەگەڵ ینزامولمولك جیا کردەوە و ناردی بۆ وڵاتی کەرەج.[١٦٤] تا هێرش بکەنە سەر چەند قەڵا و شارێکی بیزەنتی،

---

[١٥٣] ئەرمەنیا: هەرێمێکی ساخاویە، لە باکووری چیاکانی قەفقاس و وڵاتی (کەرەج)، لە باشوریشدا ناوچەکانی هەکاری و ویلایەتی دیاربەکری سەر بە جەزیرەی فورات، لە ڕۆژهەڵاتیشی هەرێمەکانی (ئازەربایجان) و (ئاران)، لە ڕۆژهەڵاتیشدا هاوتخوبی وڵاتی ڕۆم بوو. مۆمەڵێك قەڵا و شاری لەخۆ دەگرت، وەك: (مەڵازگرد، خەلات، بەدلیس، هتد). وەرگیراوە لە (نیشتمان بەشیر: س.پ، ل١٦).

[١٥٤] کەرەج: گەلێکی مەسیحی بوون، لە وڵاتی (ئەبخاز) دادەنیشتن، کە ناوچە درێژەوەبووەکەی نێوان زنجیرە چیای (قفقاس) و تا کەنارەکانی دەریای ڕەش دەگرێتەوە، سەرچاوەکان ناوی وڵاتی (کەرەج) یان بەسەر وڵاتی (ئەبخاز) دا دەبرد، ئەمەش چونکە بنەماڵەیەکی فەرمان ڕەوا لە (ئەبخازیا) دەرکەوتن، لە سەرەتای چەرخی عەبباسی و فەرمانڕەوایی وڵاتی (کەرەج) یان کرد. وەرگیراوە لە (نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل٤٢).

[١٥٥] حسن کریم جاف: م.س، ص١٣٩.

[١٥٦] ناوی ئەو شارە لە سەرچاوەکاندا بە شێوازی لێکجیا هاتووە، لەوانە: ( مەنازجەرد، ملازگرد، منزکرت، مەلازگەرد، مەنازگەرد، مازنگەرد، مانزگرت)، یاقوتیش دەڵێت: ((نانیشتوانەکەی پێی دەڵێن (مەنازگەرد) .. (معجم البلدان، ج٥، ص٢٠٢) .

[١٥٧] هەرێمێکی فراوانە و لەماوەی سەردەمی عەبباسیدا، لە ڕۆژهەڵاتەوەی وڵاتی دەیلەم، لە باکورەوە ڕووباری ئاراس، لە باشوورەوە هەرێمی چیاکان، لە ڕۆژئاواشی لە هەرێمی جزیرەی فوراتی و ئەرمینیا دەوریان داوە. گرنگترین شارەکانی ئەم هەریمە بریتین لە: (خوی، سلماس، ورمێ، مەرەند). وەرگیراوە لە (یاقوت: م.س، ج١، ص١٢٨، ١٢٩ " باریق محمد " عبدالنعیم: س.پ، ل١١١).

[١٥٨] الحسیني: م.س، ص٣٥ " ابن اثیر: م.س، ج٨، ص١٩٤ " زبیدة عطا: م.س، ص٤٨.

[١٥٩] ن.م، ص٣٤ " عبدالعیم محمد حسنین/ م.س، ص ٥٤.

[١٦٠] مەرەند: یەکێك بوو لە شارەکانی ئازەربایجان، نێوانی لەگەڵتەبرێزدا دوو ڕۆژە ڕێیە. وەرگیراوە لە: (یاقوت: م.س، ج٥، ص١١٠).

[١٦١] الحسیني: م.س، ص٣٥ " ابن اثیر: م.س، ج٨، ص١٩٤ " زبیدة عطا: م.س، ص٤٨ " نیشتمان بەشیر محمد: س.ث، ل ٢٠٤.

[١٦٢] ڕووباری ڕەس: لە قالیقلا هەڵدەقوڵێت و بە ئاراندا تێدەپەڕێت. وەرگیراوە لە: (الصلابي: دولة سلاجقة، ص٨٦).

[١٦٣] ن.م، ص٨٦.

[١٦٤] الذهبی: تأریخ الاسلام، ج١/ ص٢٨٦ " ابن کثیر: م.س، ج١١، ص١٠٣ " دائیرة المعارف الاسلامیة: م.س، ، ص٥٠٣.

لەوانەش قەڵای (سەرماری)[١٦٥]، هێرش کرایە سەر ئەو قەڵایە و لەلایەن سەربازەکانی مەلیکشاهەوە فەتح کرا. ئینجا ئەو هێزانە گەیشتنە شاری سەنگەرگیر و پتەوی (مریەم نشین) ئەم شارە شوێنی پیاوە گەورەکانی گاورەکان بوو، قەڵاکانی سەخت و پتەوبوون، ئەویشیان فەتح کرد.[١٦٦] ئیتر هێرشەکانیان بەردەوام بوو، تا توانیان دەست بەسەر زۆربەی شار و قەڵای ناوچەکەدا بگرن و سامانێکی زۆریان دەست کەوت.[١٦٧]

وا دیارە کە پاشای (کەرەج) ترس و بیمی ڕۆچوونی سەلجووقی بە ناو قوڵایی ناوچە ئەرمینیەکاندا گرتبێتی، بۆیە لەگەڵ ئەلب ئەرسەلان ئاگر بەستی بەست و لەسەر پێدانی سەرانە لەگەڵیدا ڕێك کەوت.[١٦٨]

ئەلب ئەرسەلان خۆشی درێژەی بە فتوحاتە گەورەکانی لە زەویە ئەرمینیەکادادا.[١٦٩]

دوای تەواو بوونی لە ئامادەکاریەکانی سوپاکەی ب هێرشە گەورەکەی بۆ سەر شاری (ئانی)[١٧٠]،هێزەکانی دەستیان بە خشیین کرد بەرەو ئەرمینیا، ڕوویان کردە شاری (قارس)[١٧١] و فەتحیان کرد. سوڵتان هەر لە ڕێگەی خۆی دەستی بەسەر ژمارەیەك قەڵای دیکەدا گرت و لە هیچ شوێنێ جێگیر نەبوو هەتا گەیشتە (ئانی) و بینی شارێکی قایم و تۆکمە کراوە، لەسەر شاخەکان شورا دروستکرابوو، لوتکەی شاخەکانیش قەڵای قایمی لێبوو، کە قەڵای پارێزەری ئیمپراتۆری بیزەنتی بوو، ئەم شارە پێگەی وڵاتی ڕۆم بوو هەرچی خزێنە و سامانیان هەبوو لەم قەڵایانەدا بوو، سوڵتان ئابڵۆقەی خستە سەری و گەمارۆی دا و دوای کۆششێکی گەورە و هەوڵدانێکی زۆر فەتحی کرد و هاتە نێوی.[١٧٢] هەواڵی فەتح کردنی ئەو شارەگەیشتە پایتەختی خەلافەت و موسوڵمانان پێی دڵخۆش بوون، ئەمەش لە ساڵی (٤٥٦ك/١٠٦٤ز) دا بوو.[١٧٣]

سوڵتان درێـژەی بـە فراوانخوازیـەکانی دا لـە سـاڵی (٤٥٧ك / ١٠٦٥ز) لـە جیحـون پەڕییـەوە و چـوو بـۆ ناوچەکانی( جند و صبران) و بەرپرسی ئەوێ پێشوازی لێکرد و ملکەچی خۆی بۆ ئەلب ئەرسەلان نواند، ئەویشی لە دەستەڵاتدا هێشتەوە.[١٧٤]

ئینجا سوڵتان لە ساڵی (٤٥٩ك / ١٠٦٧ز) دا بەرەو ئەسفەهان بەڕێکەوت و لەوێوە چوو بۆ (کرمان) پاشای کرمان سەرکەشی لەڕووی ئەلب ئەرسەلاندا نواند کا ناوی (قورا ئەرسەلان) بوو، شەڕ لەنێوان سوپای سوڵتان و پاشای کرمان ڕوویدا و سوپای سوڵتان سەرکەوت، بەمە (قورا ئەرسەلان) ملکەچی خۆی هێشتەوە.[١٧٥]دوای ئەوە

---

[١٦٥] قەڵای سەرماری: لە بنەچەدا (شەرماری) یە، قەڵایەکی گەورە و هەرێمێکی بەرفراوانی نێوان (تەفلیس و خەلات) ە. وەرگیراوە لە: یاقوت: م.س، ج٣، ص٢١٥).

[١٦٦] الحسيني: م.س، ص٣٥، ٣٦ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص ٨٧.

[١٦٧] الذهبي: تأريخ الاسلام، ج١، ص٢٨٦ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٣.

[١٦٨] الحسيني: م.س، ص٣٨، دائيرة المعارف الاسلامية، ج٢، ص٥٠٣.

[١٦٩] الصلابي: دولة السلاجقة، ص ٨٧.

[١٧٠] ئانی: شارێکی ئەرمەنیە و کەوتۆتە باکوری ڕۆژهەڵاتی ئەرمینیا، دەکەوێتە سەر کەناری (ئەیمەن) لە ڕووباری (ئەرپاتشا) ی، لە دوای ٢٠ میل ئەم ڕووبارە لەگەڵ ڕووباری (ڕەس) یەك دەگرێت. ئەسڵی ناوی ئەم شارە لەلایەن هەندێ توێژەر نەناسراوە، دەیگەڕێننەوە بۆ ناوی (پەرستگایەکی خوای ئەناهیتە) کە ئێرانیەکان ئەیان پەرست، پێش سەردەمی مەسیح ئەم شارە ئاوەدان کراوەتەوە. وەرگیراوە لە: (یاقوت: م.س، ج١، ص٢٥٧ " دائيرە المعارف الاسلاميە: م.س، ج٣، ص٥٨).

[١٧١] قارس: یەکێکە لە شارەکانی ئەرمینیا لە ساری (تەفیس)، نێوانی لەگەڵ تەفلیس دووڕۆژە ڕێیە. وەرگیراوە لە: (یاقوت: /زس، ج٤، ص٣٢٣).

[١٧٢] الحسيني: م.س، ص٣٩ " زبيدة عطا: م.س، ص٤٩ " نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل٢٠٦.

[١٧٣] نیشتمان بەشیر محمد: س.پ/ ل٢٠٧.

[١٧٤] الحسيني: م.س، ص٤٠ " ابن الآثير: م.س، ج٨، ص٢٠٤.

[١٧٥] الحسيني: م.س، ص٤١ " ابن الاثير: م.ج٨، ص٢١٠.

لەوێوە چوو بۆ (هەرێمی فارس)[176] و لەگەڵ هێزەکانی بەرەو شاری (ئیستەخر)[177] هاتنتوانی فەتی قەڵاکەی بکات، دەستکەوتیّ:ی زۆری لەم قەڵایە دەست کەوت.[178] (حوسەینی) ئاماژە بەوە دەکات: ((کە سوڵتان لە خەزێنەکانی ئەم قەڵایە شتی وای دەردەهێنا نە چاو بینیبووی نە گوێ بیستبووی)).[179]

دوای ئەوەی سوڵتان ئەلب ئەرسەلان توانی دەستبگرێ بەسەر ئازەربایجاندا و بەهێزەکانیەوە ڕووی کردە جۆرچیا و ئەرمینیا، پاش ئەوەی بەشی هەرە زۆری ئەو وڵاتانەی کەوتە دەست کە کەوتبوونە دەیاچەی وان و ورمێ، ڕێگە لەبەردەم سەلجووقیەکاندا کرایەوە تا بپەڕنەوە بۆ ئەنادۆڵ لەدوای ئەوەی دەستیان گرت بە سەر دڵی ئەرمینیادا، بوار ڕەخسا لەبەردەم هێزە سەلجوقیەکاندا بۆ تەواوکردنی لێدانە خێراکانی بۆ وڵاتی ڕۆم و شاڵاویان بردە سەر ناوچە سنووریەکان و لە ساڵی (٤٥٩ك / ١٠٦٧ز) دا دەستیان بەسەر ڕێگەی ئەمانوس دا کە بادوکیە.[180]

هەموو ئەمانە ڕوویان دا و ئیمپراتۆری بیزەنتی بۆ بەرگری کردن لەو شاڵاوانە هەوڵێکی گەورەی نەخستە گەڕ، ئەمەیش هانیدان تا بچنە قووڵایی ئەنادۆڵ و لە ساڵی (٤٦١ك / ١٠٦٩ز) دا گەیشتنە (نیسکار)[181] و (عموریە)[182] و لە ساڵی داهاتووشدا گەیشتنە (قونیە)[183] و لە ساڵی (٤٦١ك / ١٠٧١ز) یشدا گەیشتنە خونیەی نزیك لە کەناری دەریای ئیجە.[184]

فتوحاتی سەلجوقیەکان بۆ وڵاتی کەرەج و بەشی گەورەی ئەرمینیا هەڕەشەیەکی دەنواد بۆ بیزەنتە و بە تایبەتی لە دوای ئەوەی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی بەوەی زانی کە ئەلب ئەرسەلان مۆرکێکی جیهادی ئاینی لە شەڕەکانی بۆ ئەو وڵاتانە داوە و مۆرکی ئیسلامیش لە ناوچە فەتحکراوەکان دەدات، کە لێدەرباز بوونی نەبێ.[185]

لە ڕاستیدا بەرگریی ئەلب ئەرسەلان لە جیهانی ئیسلامی (ڕۆمانوس دیوجینوس) ئیمپراتۆری ڕۆمی تورە کرد، بۆیە هەوڵی بنیادنانی بزوتنەوەیەکی دژ بۆ پارێزگاری کردن لە ئیمپراتۆریەتەکەی.[186]

کاتێك ئیمپراتۆر دڵنیا بوو لەوەی سەلجووقیەکان دەیانەوێت دەوڵەتی بیزەنتی لەناوبەرن و لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە دەورەی بدەن، بە پەلە کەوتە ئامادەکردنی سوپایەکی گەورە کە پێکهاتبوو لە (ڕۆم و ڕووسی و کەرەجی و بجناك) کە ژمارەی سوپاکەی بە نزیکەی (٢٠٠) هەزار سەرباز مەزندە دەکرا.[187] ئیمپراتور بەخۆی و سوپاکەی بەرەو وڵاتی موسوڵمانان هات گەیشتە مەلازگرد.[188] بە مەبەستی زەبر وەشاندن و لەناو بردنی

---

[176] هەرێمی فارس: هەرێمێکە لە ڕۆژهەڵاتەوە هەرێمی کرمان، لە ڕۆژئاواوە هەرێمی ئەهواز، لە باکوورەوە هەرێمی ئەسفەهان، لە باشووریشەوە کەنداو دەوریان داوە. شارە گرنگەکانییشی: (شیراز و ئەردەشێر و ئیستەخر و هی دیکەن). وەرگیراوە لە (یاقوت: م.س، ج٤، ص٢٢٦-٢٢٧).

[177] ئیستەخر: شارێکی هەرێمی فارسە، دەکەوێتە بەشی باشووری ئەو هەرێمەوە، لە قەڵا و شار و ئاواییە ناودارەکانی (فارس)ە. وەرگیراوە لە (ن.م، ج١،ص٢١١).

[178] الحسيني: م،س، ص٤٢.

[179] أخبار الدولة السلجوقية، ص٤٢.

[180] الصلابي: دولة السلاجقة، ص٨٧ " حسن أمين: العراق العصر السلجوقي، ص١٣٧.

[181] نيسكار: یەکێ لە شارەکانی ویلایەتی (سیماس) ە و دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەڵاتی تورکیا. وەرگیراوە لە (الصلابي: دولة السلاجقة، ص٨٧).

[182] عموريە: شارێکە لە وڵاتی ڕۆمدا، وەرگیراوە لە: (یاقوت: م.س، ج٤، ص١٥٨).

[183] قونیە: یەکێ بووە لە گەورەترین شاری ئیسلامی لە ڕۆم، شوێنی کاتی مانەوەی دەستەڵاتدارەکان بووە. وەرگیراوە لە: (ن.م، ج٤، ص٤١٥).

[184] الصلابي: دولة السلاجقة، ص٨٧ " زبيدة عطا: م.س، ص٤٩.

[185] الصلابي: دولة السلاجقة، ص٨٧.

[186] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٤ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٣٨ " الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، ل٤١.

[187] الأصفهاني: م.س، ٢٠٦ " ابن الجوزي: م.س، ج٧، ص٢٦١ " ابن الأثير: م.س، ج٨، ص٢٢٣ " الحسيني: م.س، ص٤٧ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦٢ " الحنبلي: م.س، ج٣، ص٣١١.

[188] الذهبي: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٥ " الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٣٩٧.

دەوڵــەتی ئیــسلام و موســوڵمانان و پاراســتنی ســەروەری دەوڵــەتی بیــزەنتی لــە ئــەرمینیا دوای ئــەوەی سەلجووقیەکان سەروەری دەوڵەتی بیزەنتی لە ئەرمینیا دوای ئەوەی سەلجوقیەکان سەروەری بیزەنتیەکانیان لەم ناوچەیەدا خستە مەترسیەوە، ئەرمینیا خاوەن ستراتیژیەکی گەورە بوو لەلایەن بیزەنتەکانەوە بۆ ئەوەی بەکاری بهێنین لە دژی بەرەکانی پێشەوەی ئیسلامی بەرقەرارکردنی ئارامی بۆ دەوڵەتەکەیان.[189]

ئیمپراتۆر ڕۆمانوس بڕیاری دا لە دەوروبەرەوە هێرش بباتە سەر دەوڵەتی ئیسلامی یەکێکیان بۆ گرتنی (خەڵات)[190]، بەرەی بەرەی دووەمیشیان بە سەرکردایەتی خۆی بەرەو (مەلازگرد)[191] ی هێنان.[192]

ئەوکاتە ئەلب ئەرسەلان لە شاری (خوی) ی ئازەربایجان دەبێت و ئەو هەواڵەی پێدەگات،[193] بۆیە لە جیاتی ئەوەی بەرەو میسر بڕوات هەڵمەتەکەی خۆی بەرەو باکور گۆڕی و بڕیاری دا لەگەڵ ڕۆمانوس بجەنگێت.[194] ئینجا خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سوپای بیزەنتی ئامادە کرد بە سوپایەکی نزیکەی (١٥) هەزار سەربازی یەوە، کە ژمارەی سەلجوقیەکان لەگەڵ ژمارەی ڕۆم و شوێنکەوتووەکانیدا بەراورد ناکرێت و زۆر لە یەك جیاوزاز بوون.[195]

سوڵتان ئەلب ئەرسەلان لەگەڵ هێزە کەمەکانی هاتنە دەر بۆ ئەو مەبەستە، بەڵام شانسی ئەلب ئەرسەلان لەوەدا بوو کە ئیمپراتۆر ئاگاداری ئەم گۆڕانکاریانەی ئەو نەبوو، تا ئەوکاتەی سوپای سەلجووقی لێی نزیك بوویەوە، بۆیە نەیتوانی سوپاکانی خەلات بگێڕێتەوە.[196]

سوڵتان دەرفەتی بەدەستەوە نەبوو تا داوا لە ناوچەکانی شوێنکەوتەی خۆی بکات، بۆیە ئەم وتەیەی ووت: ((من لەلای خوا چاوەڕێی پاداشتم بۆ خۆم با بە شەهیدیش بەختەوەربم، لەناو سکی باڵندەی سەوزدا لەجیاتی سکی سیسرکی بۆردایە گۆڕم، ئەگەر سەرکەوتم چەند بەختەوەرم و شەو دەکەمەوە، ڕۆژیشم باشترە لە شەوم)).[197]

سوڵتان لە شوێنێك کە پێی دەڵێن (زەهوە) یان (زەهرە) کە دەکەوێتە نێوان خەلات و مەلازگرد لە ئیمپراتۆری بیزەنتی نزیك بوویەوە و لە ڕۆژی (چوارشەممە ٢٥ ی ذی القعدة ی ساڵی ٤٦٣ك / ١٠٧١ن) هەردوو سوپای سوڵتان و ڕۆمانوس بەرامبەریەك ڕاوەستان.[198]

سوڵتان لە زۆری ژمارەی سەربازانی ڕۆم ترسی هەبوو، ڕێککەوتن و ئاشتی لەگەڵ ڕۆمدا پێ باشتر بوو لە شەڕی نا بەرامبەر، بۆیە سوڵتان وەفدێکی لەلایەن خۆیەوە بۆ لای ئیمپراتۆری ڕۆم نارد و پێشنیاری کرد[199]، بەڵام ئەو خۆ بەزل زانی و سەرکەشی دایگرت و پێشنیارەکەی قبوڵ نەکرد، وتی: ((هیچ ئاگر بەست و هیچ گەڕانەوەیەك نیە مەگەر لە دوای ئەوەی موسوڵمانان چییان کرد بە وڵاتی ڕۆم منیش ئاوا بە وڵاتی ئیسلام

---

[189] حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، ٧٤.

[190] خەڵات: شارێکی بەناوبانگی ئەرمینیایە، دەکەوێتە کەنارەکانی دەریاچەی وان. وەرگیراوە لە: (ياقوت: م.س، ج٢، ص٣٨٠-٣٨١).

[191] مەلازگرد: شارێکی بەناوبانگی نێوان خەلات و ڕۆمە، نزیکە لە ئەرمینیا و دانیشتوانەکەی ئەرمەنی و ڕۆمن. وەرگیراوە لە: (ن.م، ج٥، ص٢٠٢).

[192] تامارا تالبوت رايس: م.س، ص٣٧ " نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل٢٣٩ " زبيدة عطا: س.م، ص٥٠.

[193] الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٣٩٧ " الذهبي: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٥ " دائرة المعارف الاسلامية " م.س، ج٢، ص٥٠٣.

[194] تامارا تالبوت رايس: م.س، ص٣٧.

[195] الأصفهاني: م.س، ص٢٠٦ " ابن الجوزي: م.س، ج٧، ص٢٦١ " الحسيني: م.س، ص٤٧ " ابن الأثير: م.س، ج٨، ص٢٣٣ " الذهبي: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٥ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٣٨ " عبدالله رازي: م.س، ص١٩٠ " محمود بن محمد اقسرائي: م.س، ص١٦.

[196] تامارا تالبوت رايس: م.س، ص٣٧.

[197] الأصفهاني: م.س، ص٢٠٧.

[198] ن.م، ص٢٠٨ " الحسيني: م.س، ص٤٩ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦٢ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١١٥ " الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، ل٤٢.

[199] الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٣٩٧ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٦ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٨٨.

بکەم[٢٠٠]، ئینجا وتی هیچ ئاگر بەستێ نیە مەگەر بە پێدانی (ڕەی) نەبێ))[٢٠١]، سوڵتانیش بەمە تووڕە دەبێ، بەڵام شەرعناس و پێشەواکەی (ئەبو نەسر موحەممەدی کوڕی عەبدولمەلیکی بوخاری حەنەفی) بە ئەلب ئەرسەلانی وت: ((تۆ بۆ ئایینێك دەجەنگیت کە خوا بەڵێنی داوە سەری بخات و زاڵی بکات بەسەر هەموو ئایینەکاندا، خوازیارم خوای گەورە ئەم فەتح کردنەی بەناوی تۆوە نووسیبێت، ئامادەی پێدا کە با ڕۆژی هەینی و دوانیوەڕۆکەی دیاری بکرێت بۆ شەڕەکە، لەوکاتەی ووتار بێژەکان لەسەر مینبەرەکان نزا و پاڕانەوە لە خوا بۆ سەرکەوتنی موجاهیدان دەکەن ڕووبەڕوویان ببنەوە))[٢٠٢].

سوڵتانیش وەستا تا هەینی هات، کاتێك دوای نیوەڕۆی هەینی هات هەردوو سوپا لەساڵی (٤٦٣ك/١٠٧١ز) دا لە (مەلازگرد) وویلایەتی (خەلات) ی ئاسیای بچووك ڕووبەڕووی یەکتر وەستان[٢٠٣].

لەوکاتەدا سوڵتان لە ڕۆمەکان نزیك بوویەوە و لەئەسپەکەی دابەزی و کڕنووشی بۆ خوا برد و دەستی کرد بە گریان و ملکەچی بۆ خوا نیشاندا و نزا و پاڕانەوەیەکی زۆری کرد داوای سەرکەوتنی لە خوا کرد[٢٠٤]، پاشان سەرکەوتەوە و موسوڵمانان هێرشیان برد و ڕاستگۆیانە شەڕیان کرد و خۆڕاگر بوون و بەوپەڕی هێز و توانایانەوە شەڕیان کرد، تا لە کۆتاییدا سەرکەوتن بۆ سەلجوقیەکان بوو، سوپای ڕۆم تێك شکا، سەلجووقیەکان ژمارەیەکی زۆریان لە ڕۆمەکان کوشت و زۆریشیان لێ بەدیل گرتن.[٢٠٥] لەسەرووی هەمووشیانەوە خودی ئیمپڕاتۆر (ڕۆمانوس) بەدەستی کۆیلەیەکی ڕۆمی کە موسوڵمان بووبوو دەستگیر کرا و هێنای بۆلای سوڵتان[٢٠٦].

کاتێك ئیمپڕاتۆریان بەدیل کراوی هێنایە بەردەم سوڵتان، سوڵتانیش بە قامچی لێیدا و پێی ووت: مەگەر پێم ڕانەگەیاندی و داوای ئاگربەستم لێ نەکردیت؟ ئەویش ووتی: کەم سەرکۆنەم بکە، سوڵتان ووتی: ئەگەر تۆ لەجێی من بویتایە چیت دەکرد؟ ئەویش ووتی: هەموو خراپەیەکم لەگەڵ دەکردی. سوڵتان ووتی: ئەی هیوا و گومانت بە من چیە؟ ئەویش ووتی: یان دەمکوژی، یان بە وڵاتەکەتدا دەمگێڕیت و دەمکەیتە گاڵتەجاری وڵات، یان ڕێگەی سێهەمیشیان کە دوورە لێبوردن و ڕازی بوون بە خۆ سەندنەوەم بە پارە. سوڵتان ووتی: من هەر نیازی سێهەمم هەبووە[٢٠٧].

لە کۆتاییدا لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کە ڕێککەوتنێك لەنێوان هەردووولادا ئیمزا بکەن، ئەوەبوو سوڵتان لەبەرامبەر چەند مەرجێکی ڕازی بوو لەسەر ئازادکردنی ڕۆمانوس[٢٠٨]، لە گرنگترین بەندەکانی ئەو

---

[٢٠٠] ابن الجوزی: م.س، ج٧، ص٢٠٧.

[٢٠١] الأصفهاني: م.س، ص٢٠٨ " الحسيني: م.س، ص٤٩ " الذهبي: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٥ " الذهبي: تأريخ الأسلام، ج٢، ص١٦٢.

[٢٠٢] الأصفهاني: م.س، ص٢٠٨ " الحسيني: م.س، ص٤٩، ابن الأثير: م.س، ج٨، ص٢٢٣ " الذهبي: سير اعلام النبلاء، ج١٨، ص١١٥ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١١٥ " أحمد تمام: م.س.

[٢٠٣] الحسيني: م.س، ص٤٩ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦٢ " الراوندى: م.س، ص١١٩ " دون اسم مؤلف: أخبار السلاجقة الروم، ت، ر/ محمد سعيد جمال الدين، ط١، المجلس الاعلى الثقافة، (القاهرة، ٢٠٠٧ز)، كي لسترنج: بلدان الخلافة الشرقية، ت، ر/ بشير فرانسيس و كوركيس عواد، ط١، مطبعةالرابطة، (بغدارد، ١٩٥٤ز)، ص١٧٢ " حسين أمين: العراق في العصر السلجوقى، ص٧٤ " محمد خضرى بك: محاضرات تأريخ الامم الاسلامية، ص١٤٧.

[٢٠٤] الحسيني: م.س، ص٥٠ " ابن الاثير، ج٨، ص٢٢٤ " الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٣٩٧ " الذهبي: سيراعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٦.

[٢٠٥] الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٣٩٧ " ابن الاثير: م.س، ج١١، ص١١٥ " سيوطي: م.س، ص١٨٢ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٦ " حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، ص٧٤ " عبدالله رازى: م.س، ص١٩٠ " محمد خضرى بك: محاضرات تأريخ الامم الاسلامية...، ص١٤٧ " أحمد تمام: م.س.

[٢٠٦] الاصفهانى: م.س، ص٢٠٩، ٢١٠ " ابن الجوزى، م.س، ج٧، ص٢٦٢ " الحسيني: م.س، ص٥٢ " الراوندى: م.س، ج١٩٩ " كي لسترنج: م.س " ص١٧٢ " محمود بن محمد اقسرائى: م.س، ص١٦.

[٢٠٧] ابن الجوزي: م.س، ج٧، ص٢٦٣ " ابن الاثير: م.س، ج٨، ص٢٢٤ " ابن كثير: م.س، ج١١،ص١١٥.

[٢٠٨] الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٣٩٨ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٧ " نيشتمان بەشير محمد: س.پ، ل٢٤٣ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٢٨

ڕێککەوتننامەیەش، ئەو بەندە بوو کە ئاشتەوایی نێوان هەردوولا پەنجا ساڵ بخایەنێت، هەروەها ئیمپراتۆر لەبەرامبەر ئازاد کردنەکەی ملیۆنێك و پێنج سەد هەزار دینار بدات، هەرکاتێکیش سوڵتان پێویستی بوو، ئەوا ئیمپراتۆر سوپای ڕۆمی بۆ ڕەوانە بکات، هەروەها مەرجێکی دیکەی سوڵتان لەسەر ئیمپراتۆر ئەوە بوو، کە هەموو دیلە موسوڵمانەکانی وولاتەکەی ئازاد بکات.[209]

پاشان سوڵتان هەڵوێستی جوانی لەگەڵ پاشای ڕۆمدا نواند و پۆشاکی کردەبەری و کۆمەڵە سەربازێکی لەگەڵدا بەردان و خەرجی ڕێگەی پێدا و چەند کیلۆمەترێکیش بۆ ماڵئاوایی لێکردن لەگەڵیاندا چوو، سوپایەکیشی لەگەڵدا نارد تاکە بیپارێزن تا دەگاتە وڵاتی خۆی.[210]

ئەو ڕێککەوتنەی لەنێوانیاندا بەسترا هیچ بەرهەمێکی وای نەبوو، چونکە کاتێك ئیمپراتۆر گەڕایەوە بۆ وولاتەکەی بینی دەستدارە بیزەنتیەکان و قوستەنتینیە هەنگاویان بۆ لابردنی ئیمپراتۆر ڕۆمانۆسی چوارەم ناوە و لە جیاتیدا (میخائیلی حەوتەمی کوڕی قوستەنتینی دەیمیان داناوە.[211]

## شەڕی ملازگرد و ئەنجامەکانی لەسەر داهاتووی بیزەنتینیە و جیهانی ئیسلامی:

١- شەڕی مەلازگرد بە شەڕە یەکلاکەرەوەکانی ناو مێژوو دادەنرێت و هەندێ مێژوونووس بە ناوی (داستانی گەورە) ناوی دەبەن، خاڵێکی وەرچەرخان بوو لە مێژووی ئیسلامیدا، چونکە سەلجوقیەکان درێژەیاندا بەو تێکۆشانەی عەرەبە موسوڵمانەکان لە دژی ڕۆمەکان ئەنجامیان دەدا.[212] توانیان بەم سەرکەوتنە ڕۆمەکان ڕابماڵن کە هەردەم وەك دوژمنێك ململانێیان کردووە دژ بە عەرەبە موسوڵمانەکان. ڕۆمەکان هەمیشە سووربوون لەسەر دەست بەسەراگرتنی وولاتی ئەرمەن و دەوروبەری و بە پردێکی نێوان ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوایان زانیوە، کە هەر ئەمە ئەم وولاتانەی کردبووە مەیدانی ململانێی نێوان فارس و ڕۆم لە ئیسلام دا، پاشان موسوڵمانەکانیش هەوڵیان دەدا بیخەنە ژێر دەستی خۆیان بە هەر شێوەیەك بێت، تا شەڕی مەلازگرد ڕووی دا. ئیتر لەو کاتەوە دەسەلاتی ڕۆم وورده وورده کەم بۆوە تا وای لێهات بە تەواوی نەما.[213]

٢- شەڕی مەلازگر دەرگای چوونە پێشەوەی لەبەردەم سەلجوقیەکان کردەوە بەرەو دڵی ئاسیای بچووك، لەوکاتەی داڕووخانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی دەستی پێکرد، بڵاوبوونەوەی شارستانێتی یۆنانی و داب و نەریتی نەسرانی ئەو ناوچەیە وەستا. دەوڵەتی بیزەنتیش ورده ورده بۆیەکهاتەوە و لاواز بوو، زۆر بەشی

---

[209] الذهبي: سيراعلام النبلاء، ج١٨، ٤١٦ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦٢ " سيوطى: م.س، ل١٨٢ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص٤١٥ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٧، الصلابي: دولة السلاجقة، ص٨٩.

[210] ابن الجوزى: م.س، ج٧، ص٣٩٨ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص٤١٦ " الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، ل٤٣ " عبدالله رازى: م.س، ص١٩٠.

[211] الذهبي: سيراعلام النبلاء، ج١٨، ص٤٢٦ " دائيرة المعارف الاسلامية: م.س، ج٢، ص٥٠٣ " تاماراتالبوت رايس: م.س، ص٣٩ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٩١.

[212] حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، ص٢٥١، ٢٥٢.

[213] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٧ " حسن كريم جاف، م.س، ج٢، ص١٣٩.

ئیمپراتۆریەت لە دەستیان دەرهات و لکا بە جیهانی ئیسلامی یەوە، بەمەش ئیسلام و شارستانێتی ئیسلامی بە هەموو بیروباوەڕ و ڕێسا و ڕەوشت و دیاردە و ڕوکانیەوە دەستی کرد بە بڵاوبوونەوە لەم وڵاتانەدا.[٢١٤]

٣- شەڕی مەلازگرد بەسەختترین شەڕ دادەنرێت، بە گەورەترین بەدبەختیش دەژمێردرێت کە بەسەر بیزەنتیەکان هاتبێت لە مێژووی ئیمپراتۆریەتیاندا، بەڵکو گەورەترین کارەسات بوو کە تا کۆتایی سەدەی پێنجی کۆچی تووشی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی هات.[٢١٥] هەر لەبەر قورسی ئەو شەڕەش لەسەر دڵی بیزەنتیەکان، بە دەستەواژەیەکی تەقلیدی ئاماژەیان بۆ ئەو ڕۆژە دەکرد ناویان دەنا (ئەو ڕۆژە زۆر ناخۆش بوو).[٢١٦]

ئەم شەڕە بەڵگەیەکیش بوو بۆ کۆتایی ڕۆڵی دەوڵەتی بیزەنتی لە پاراستنی نەسرانیەت لە فشاری ئیسلام و پاسەوانی دەرگای ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا لە هێرشی موسوڵمانان و خاچپەرستان. دواتر بۆیان دەرکەوت کە بیزەنتیەکان چی نازناوی پارێزەرانی جیهانی نەسرانیان لە خۆگرتبوو، لە شەڕەکەدا لە دەستیاندا،[٢١٧] هەر ئەو شەڕەش بوو بە بەڵگە و بیانوو بۆ ئەو دەستێوەردانەی ڕۆژئاوای ئەوروپی، چونکە بیزەنتە نەیدەتوانی پارێزگاری جیهانی نەسرانی لە ڕۆژهەڵات بکات.[٢١٨] کە یەك لەو هۆکارە سەرەکیانەی بووە هۆی سەرهەڵدانی شەڕەکانی خاچپەرستان لە دواتردا، شکانی بیزەنتە بوو لە (مەلازگرد).[٢١٩]

٤- شەڕی مەلازگرد ڕووداوێکی گەورەی نێو مێژووی ئیسلامی بوو بە شێوەیەکی گشتی، چونکە ڕێگەی بۆ لەناوبردنی دەستەڵاتی بیزەنتیەکان بەسەر زۆربەی بەشەکانی ناوچەی ئاسیای بچووکدا ئاسانکرد، ئەمەش یارمەتی ئەوەی دا دواتر لەسەر دەستی تورکە عوسمانیەکان خودی دەوڵەتی بیزەنتی لەناو بچێت.[٢٢٠]

٥- شکستی بیزەنتیەکان لە مەلازگردا زیانێکی گەورە و کاریگەر بوو بەر دەوڵەتی بیزەنتی کەوت، چونکە بۆ یەکەم جار ئیمپراتۆر بە دیلیی دەکەوێتە دەستی موسڵمانان،[٢٢١] بەمەش ئیمپراتۆر تەختەکەی لەدەست دا دوای ئەوە ململانێ کەوتە نێوان سەرکردە ڕۆمیەکان لەسەر گرتنە دەستی دەستەڵات.[٢٢٢] ڕۆمانوس لە نێوەندی ئەو ململانێیەدا هەوڵیدا پەنا بۆ هێزە تورکیەکان ببات و پشتیان پێ ببەستێت، بەڵام تووشی کشست بوو بڕیاردرا لەناو ببرێت و هەردوو چاوی هەڵکۆڵدرا.[٢٢٣]

ئەم شەڕە گرنگیەکی یەکجار گەورەی هەبوو بۆ جیهانی ئیسلامی، چونکە سەرەنجامی ئاسیای بچووکی یەکلاکردەوە کە تورکە سەلجووقیەکان توانیان فەتحی بکەن وتیایدا ڕۆبچن، ئەمەش درزێك بوو کەوتە بنیادی دەوڵەتی بیزەنتی و ڕێگەی بۆ دەرکەوتنی خۆش کرد.

کاتێك ئیمپراتۆریەتەکە ویلایەتە دەوڵەمەندەکانی خۆی لە ئاسیای بچووکدا لەدەستدا قوستەنتینیەبوو بە سەرێکی بێ لەش، بەمە ئاسیای بچووك لەبەردەم سەلجوقیەکان بەدیارکەوت و بەیەك گورز ئەو سنوورە کۆنانەی

---

[٢١٤] حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، ص٢٥٢ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٨.

[٢١٥] حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، ص٢٥١ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٩١.

[٢١٦] نيشتمان بەشير محمد: س.پ، ل٢٤٢.

[٢١٧] زبيدة عطا: م.س، ص٥١ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٩١.

[٢١٨] حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، ص٢٥٢ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٣٨.

[٢١٩] نيشتمان بەشير محمد: س.پ، ل٢٤٢.

[٢٢٠] عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٧

[٢٢١] الصلابي: دةولة السلاجقة، ص٩٠.

[٢٢٢] تامارا تالبوت رايس: م.س، ص٣٩ " نيشتمان بەشير محمد: س.پ، ل٢٤٢.

[٢٢٣] ابن كثير: م.س، ج١١، ص٤١٦.

که ماوەی چوارسەد میل ئیسلام و مەسیحیەتیان لێکجیاکردبوویەوە نەما و بەرەو ڕۆژئاوا باڵی پێوەنا و بۆ یەکەم جار تورکە سەلجوقیەکان توانیان لەو ناوچانەدا جێ پێ یەکی جێگیریان هەبێت.[224]

٦- تورکەکان بە زیاترین ڕەگەزی سەربازی بیانی دادەنرێت کە سودیان لەو بارودۆخە پێکدادراوەی کە کۆمەڵگەی بیزەنتی و باری سیاسی شەڕی مەلازگرد دایگرتبوو وەرگرتبێ، جا دەستەوتاقمە دژ بە یەکەکانی ناو بیزەنتە هەوڵیاندا دژ بە یەکتر پشت بەهێزە تورکیەکان ببەستن، ئومە هەلێ بۆ سەلجوقیەکان ڕەخساند تا ڕۆبچنە ناخی بیزەنتەوە.

زۆربەی ئەباتیرە بیزەنتیەکان لە دوای ڕۆمانوسی چوارەم هەرکات سەختیەکیان بەرەو ڕوو ببایەتەوە هەمان ڕێبازی ئەویان لە پشت بەستن بە تورکەکان گرتەبەر.[225]

٧- لە ئەنجامەکانی مەلازگر بریتی بوو لەوەی سەلجوقیەکان هاوپەیمانی بیزەنتی و فاتیمیان لەناو برد، دوای ئەوەی بیزەنتە ناچار بوو لەگەڵیاندا ڕێککەوتن ببەستێ، ئەرمینیاش کارگێری بیزەنتی تێدا نەما لەدوای ئەوەی دانیشتوانەکەی بەجێیان هێشت و تورکەکان هاتنە شوێنیان و شارە ئەرمینیەکان ملکەچی سەلجوقیەکان بوون.[226] هەروەك نیزامی بەرگری بیزەنتی کە سەرکردەکانی سنوور گرتبوویانە دەست دارما، سەربازەکانی سەر سنوور پەیوەندیان بە موسوڵمانەکانەوە کرد، بەمەش نیزامی سنووری بیزەنتە تووشی شکستی گەورەبوویەوە، بەتایبەت کاتێك بیزەنتە شکستی هێنا پەنای بۆ دابەزاندنی چەند پارێزگایەکی سەربازی بەکرێ گیراوی ئەرمینیا و دەوروبەری برد و هەوڵی نەدا پشت بە دانیشتوانە سەرەکیەکانی ببەستێت،[227] ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە دانیشتوانی ناوچەکە دژی بیزەنتە بوەستن، بۆیە تورکەکان زۆربەی زۆربەی ناوچەی ئەرمینیان فەتح کرد، بەمەش بیزەنتە هێزی خۆی لەو ناوچە لەدەستدا، چونکە پێشتر ئەرمینیەکان چەند تیمێکی سەرەکی سوپای بیزەنتیان پێك دەهێنا.[228]

لە ڕاستیدا ئەلب ئەرسەلان ئامانجی خۆی بەدەست هێنا بەوەی زامنی پاراستنی سوپاکەی کرد و مەترسی نزیك بوونەوەی بیزەنتە و فاتیمیەکانی نەهێشت.[229]

٨- یەك لە ئەنجامەکانی دیکەی ئەم جەنگە ئەوە بوو کە مەترسی بیزەنتی لەسەر ناوچە سنووریەکانی دەوڵەتی عەباسی نەما، کە پێشتر بەدەست هەڕەشە و هێشە بەردەوامەکانی بیزەنتیەکان دەیان ناڵاند.[230] لەبەر گرنگی ئەو سەرکەوتنەش کە لە (مەلازگرد) وەدەست هات سەبارەت بە عەباسیەکان، خەلیفە (قائم) بە نامەیەك پیرۆزبایی ئەو فەتحەی بۆ سوڵتان نارد کە تیایدا هاتووە: (کوڕێ سەروەری گەورە، کە پشتگیری کراوی سەرفراز بە خوا، سوڵتانی گەورە، شای عەرەب و عەجەم، پشتیوانی خەڵك و دەوڵەتی زاڵ، سوڵتانی وڵاتی موسوڵمانان، سەلمێنەری ئەمیری ئیمانداران، خوا ڕێخۆشیت بۆ بکات و زیاتر خێر و بێرت بەسەردا بباریێنێت).[231]

---

[224] الصلابي: دةولة السلاجقة، ص٩٠.

[225] ن.م، ص٩١، ٩٢.

[226] زبيدة عطا: م.س، ص٥٢.

[227] الصلابي: دةولة السلاجقة، ص٩٠.

[228] زبيدة عطا: م.س، ص٥٣.

[229] الصلابي: دةولة السلاجقة، ص٩٢.

[230] نيشتمان بەشير محمد: س.پ، ل٢٤٢.

[231] الحسيني: م.س، ص٥٣ " حسن أمين: العراق في العصر السلجوقي، ص٧٤، ٧٥.

# باسی دووەم

# نیزامولملکی وەزیر و ڕۆڵی لە بەهێز کردنی دەستەڵاتی ئەلب ئەرسەلاندا

## تەوەرەی یەکەم

## کورتەیەك لە ژیانی نیزامولملك

نیزامولملك ناوی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاقی توسی یە، لە ساڵی (٤٠٨ك / ١٠٧١ز) لە (توس) لەدایك بووە،[٢٣٢] نیزامولملك فارسە و لە ڕۆڵەکانی (دهاقین توس) ە، باوکی لە بازرگانەکانی شاری (بەیهەق) ی ویلابەتی نەیسابور بووە، چووەتە بەر خوێندن، زانستی (نحو) ی خوێندووە، گرنگی بە نووسین و تومار دا، لە نووسینی داڕشتن و ئینشادا دەستێکی باڵای هەبووە.[٢٣٣]

لە شاری (غەزنە)[٢٣٤] خزمەتی لە ئیدارەی دەوڵەت دا کردووە و لەسەرەتادا خزمەتی (ئیبن شادان) ی دەکرد، کە ئیبن شادان ڕاگری (بەلخ) و وەزیری جەغری بەگ داودی باوکی ئەلب ئەرسەلان بوو، دواتر قۆناغ بە قۆناغ گەورەتر دەبوو تاکو بوو بە وەزیری ئەلب ئەرسەلان، پاشان وەزیری مەلیکشای کوڕی ئەلب ئەرسەلان. سەرەتای وەزارەتەکەی لە ڕۆژی (یەك شەممە ١٣ی ذی الحجة ی ساڵی ٤٥٥ك/ ١٠٦٣ز) بووە بۆ ماوەی نزیکەی (٣٠) ساڵ درێژەی کێشاوە، واتە تاوەکو ساڵی (٤٨٥ك/ ١٠٩٢ز).[٢٣٥]

نیزامولملك لەسەر پەیڕەوی شافیعی و ئەشعەری بووە و یەکێ بوو لەوانەی کە قورئانیان لەبەر بووە، کاتێ تەمەنی یانزە ساڵ بوو هەموو قورئانی تەواو کرد و سەرقاڵی مەزهەبی شافیعی بوو، لە هەر کۆڕێك دانیشتبێت دەستنوێژی هەبووە هەر دەستنوێژێکی سوننەتی کردووە و هەموو دووشەممە و پێنج شەممەیەکیش بەڕۆژوو بووە.[٢٣٦]

نیزامولملك کەسێکی نەرم و نیان و سەخی و دڵئاوا بووە، خاوەنی گەنجایەتیەکی بارقوڵ و چاکە خوازییەکی بێ ئەنداز بووە، لەبەرامبەر پیاوچاکان دا زێدەڕەوی لە گەردن کەچیدا دەکرد.[٢٣٧]

ئیبنولئەثیر لەبارەیەوە دەڵێت: ((لەمەڕ هەواڵی نیزامولملکەوە، ئەوا زانا و ئاین پەروەر و بەخشەر و نەرم ز نیان بوو، لێبوردنی بۆ تاوانباران زۆر بوو، زۆر بێدەنگ بوو، کۆڕەکانی بە قورئان خوێنان و فیقهناسان و پێشەوا موسوڵمانەکان و ئەهلی چاکە و چاکەخوازی سازدەدا)).[٢٣٨]

زەهەبی لەبارەیەوە دەڵێت: ((وەزیری گەروە نیزامولملك قوام الدین، باوکی عەلی کوڕی ئیسحاقی توسی، پیاوێکی ژیر و سیاسەتمەدار و پسپۆڕ و پایە بڵند و وا بەستە بە ئاین و خاکی و بێ فیز بوو، کۆڕەکانی بە قورئان خوێنان و زانایان گەرم دەکرد)).[٢٣٩]

ئەو خوازیار بوو مزگەوتێکی هەبێت و تیایدا پەرستش بکات و ڕۆژی دابین کرابێت لەم بارەیەوە دەیوت: ((من خوازیارم گوندێکی تایبەت بە خۆمم هەبێت لەگەڵ مزگەوتێکدا تیایدا بۆ پەرستنی پەروەردگارم کەنار

---

[٢٣٢] الذهبي: سیراعلام النبلاء، ج١٤، ص١٦٦ " عباس اقبال: م،س، ص٦٩ " نیشتمان بەشیر محمد: م.س، ل٢٥٢.

[٢٣٣] أبي الغداء: تاریخ أبي الغداء، ط١، دارالکتب العلمیة، (بیروت، ١٩٩٧م)، ج٢، ص١٧.

[٢٣٤] غەزنە: شارێکی گەورە و وویلایەتێکی فراوانە لەولای خۆراسانەوە، سنووری نێوان خۆراسان و هیندە. وەرگیراوە لە ((یاقوت: م.س، ج٤، ص٢٢٨).

[٢٣٥] الذهبي: سیراعلام النبلاء، ج١٤، ص١٦٥ " عباس اقبال: م.س، ص٧٠، الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، ل٤٩.

[٢٣٦] الذهبي: سیراعلام النبلاء، ج١٤، ص١٦٥.

[٢٣٧] ن.م، ص١٦٦.

[٢٣٨] وەرگیراوە لە: الصلابي: دولة السلاجقة، ص١٤١.

[٢٣٩] سیر اعلام النبلاء، ج١٤، ص١٦٥.

بگرم، پاش ماوەیەك خوازیاربووم كە هەموو ڕۆژێك كولێرەیەكم هەبێت لەگەڵ مزگەوتێك دا كە پەرستشی خوای تێدا بكەم)).[٢٤٠]

مێژوو نووسان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە نیزامولمولك لە ڕۆژئاوای ئێران لە نێوان هەمەدان و كرماشاندا لە سنووری نەهاوەند و بوجرود و لە (١٠ی ڕەمەزانی ساڵی ٤٨٥ك/١٩٢م) لە تەمەنی حەفتاوحەوت ساڵیدا كوژرانەكەشی لەسەر دەستی كەسێكی ئیسماعیلی[٢٤١] باتینی ئەنجامدرا كە بەرگی سۆفی پۆشی بوو وەك ئەوەی پەنای بۆ هێنابێت و داوای شتێكی لێ بكات، لاوە ئیسماعیلیەكە كاتێك لێی نزیك بوویەوە دایە بەر خەنجەر و كوشتی، بكوژەكەش دەكوژنەوە.[٢٤٢]

هەندێ لە خزمەتگوزارەكانی دەڵێن كۆتا قسەی نیزامولمولك ئەوە بوو كە ووتی: ((بكوژەكەم مەكوژن، چونكە من لێی خۆش بووم))، ئینجا شایەتومانی هێنا و مرد.[٢٤٣]

وتراوە نیزامولمولك بە پیلانی سوڵتان مەلیكشاه كوژراوە و دوای ئەوە تەنها نزیكەی مانگێك دوای پیلانەكە كوژراوە،[٢٤٤] چونكە وەزیر تەواو دەسەڵاتی زیادی كردبوو قسەی یەكەم هی ئەو بوو.[٢٤٥]

پەیوەندی مەلیكشاه بە هۆی پاشەملە باسكردنی ئەندامانی دیوانەوە وەك: (ئەبولغنائیم تاج الملك، موزەبانی كوڕی خەسرە، ...هتد) لە بەرامبەر نیزامولمولك تێكچوو، بەلام بە كوشتنی وەزیرەكەی باری دەسەڵاتەكەی تێكچوو.[٢٤٦]

هاوەڵاتی نیزامولمولك تەرمەكەیان برد بۆ ئەسفەهان و لە ناوچەی كەران لە شوێنێكی جوانی نایابدا لە پاڵ ڕووبارێكی گەورەدا بە خاك سپێردراوە.[٢٤٧]

---

[٢٤٠] الصلابي: دولة السلاجقة، ص١٤٢.

[٢٤١] ئیسماعیلیەكان: دەستەیەكی ناو سیعەكانن كە بڕوایان بە پێشەوایەتی ئیسماعیلی كوڕی جاعفەری صادق هەبوو، دیارترین نازناویشیان باتینیە بوو، باتینیەكانیش بە خۆیان دەوت ئیسماعیلی و لەژێر كاریگەری فەلسەفەدا بوون. وەرگیراوە لە: (الشهرستانی، الملك و النحل، ط٨، دارالمعرفة، (بیروت، ٢٠٠ن)، ج١، ص٢٢٦- ٢٣٠).

[٢٤٢] الحسینی: م.س، ص٦٧ " أبي الغداء: م.س، ج٢، ص١٧ " محمد اقبال: م.س، ص٧٤ " حسن كریم جاف: م.س، ج٢، ص١٤٢ " عبدالنعیم محمد حسنین: م.س، ص٧٣.

[٢٤٣] الحسیني: م.س، ص٦٧ " الذهبي: سیراعلام النبلاء، ج١٤، ص١٦٥.

[٢٤٤] أبي الغداء: م.س، ج٢، ص١٧.

[٢٤٥] محمد خضري بك: چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی، ل١٤٨

[٢٤٦] الحسیني: م.س، ص٦٧ " أبي الغداء: م.س، ص١٧ " عبدالنعیم محمد حسنین: م.س، ص٧٤، ٧٥.

[٢٤٧] محمد اقبال: م.س، ص٧٤.

# تەوەری دووەم

## ڕۆڵی وەزیر لە بەهێز کردنی دەسەڵاتی ئەلب ئەرسەلاندا

نیزامولموك ناودارترین وەزیرەکانی دەوڵەتی سەلجوقی بوو، بەڵکو یەکێك بووە لە گەورەترین وەزیرەکانی مێژووی ڕۆژهەلاتی لە ماوەی نێوان سەرەتای دەستەلاتداریتی ئەلب ئەرسەلان و مانگێك پێش کۆتایی هاتن بە دەستەلاتی مەلیکشاهدا کە نزیکەی ٣٠ ساڵ دەکات.[٢٤٨]

ڕۆڵێکی گرنگ و کاریگەری هەبووە لە نەخشەکانی سیاسەتی دەوڵەتی سەلجوقی دا،[٢٤٩] هەموو کارو ئەرکەکانی دەوڵەتی سەلجوقی لەدەست دابوو، سەقامگیری دەوڵەتی سەلجوقی بەهۆی نەخشە و لێهاتوویی و پاڵپشتیەکانی ئەم وەزیرەوە بوو.

نیزامولمولك ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی گێڕا لەدانانی نەخشەی سەرکەوتنی سەربازی بۆ سوڵتان ئەلب ئەرسەلان لە هێرش و داگیرکردن و کارە فراوانخوازییەکانی دا، تە سەرکەوتنەکانی ئەلب ئەرسەلان و پاشان مەلیکشاهی کوڕی دا پشکێکی گەورەی هەبوو.[٢٥٠]

المخري ئەمیری شاعیران لەبارەیەوە دەڵێت:

((تۆ ئەو وەزیرە بەختەوەرەیت کە لە سایەی لێهاتوییت دا سەری دەوڵەتی سەلجوقیت بەرز کردەوە و سەقامگیر بوو.

تۆ ئەو جێی ئاماژە وەسف کراوەیت کە پێنووسەکەت وەك شمشێری پاشا لە فتوحات دا وایە)).[٢٥١]

سەردەمی ئەلب ئەرسەلان سەردەمی گەشانەوەی دەوڵەتی سەلجوقی بوو لە هەموو ڕوویەکی گارگێڕی و زانست و شارستانی و ئابوری دا، چونکە لە سەردەمی ئەودا نیزامولمولك بە سیاسەتێکی بێ هاوتا دەوڵەتی سەلجوقی بەڕێوەبرد، گرنگی بەرێکخستنە کارگێڕیەکان دا و بۆ کاری بەڕێوەبەری دەوڵەت لە سەردەمی سوڵتان ئەلب ئەرسەلان دا دەستی ئاڕاستەکەر بوو، لەسەردەمی مەلیکشاهی کوڕیشیدا دەستەلاتەکانی فراوانتر بوو،[٢٥٢] مەلیکشاه لەدوای کوژرانی باوکی دەستەلاتی گرتە دەست و کاروباری دەوڵەتەکەی دایە دەست نیزامولمولکی وەزیری و نازناوی زۆریشی لێنا لەوانە نازناوی (ئەتابەك)ی لێنا کە بە واتای (باوکە ئەمیر) دێت.[٢٥٣] ئیتر هەر خۆی چاودێری کاری سیاسەتی ناوخۆیی و دەرەکی دەوڵەتی بەشێوەیەکی گەورە دەکرد. کتێبی (سیاسەتنامە) کە ئەم وەزیرە دایناوە، ئەو ڕاو بیرۆکە کارگێڕیانەی لە خۆ گرتووە کە بە بنەڕەتێکی نیزامی فەرمانڕەوایی و کارگێڕی دەوڵەتان و دەستەلاتەکان دادەنرێت.[٢٥٤]

لەڕوانگەی کتێبی (سیاسەتنامە) وە گرنگترین ئەو ڕێگە کارگێڕیانە دەردەکەون کە وەزیر نیزامولمولك لە کارگێڕی دەوڵەتی سەلجوقی دا گرتونیەتەبەر، لەپێش هەموویاندا ئەوە دێت کە بەتوندی دژ بە دەست تێوەردانی هاوڕێ نزیکەکانی سوڵتان لەکاروباری دەوڵەتدا دەوەستێت تائەوە نەبێتە هۆی پێکدادانی

[٢٤٨] محمد اقبال: م.س، ص٧٤.

[٢٤٩] نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل٢٥٢.

[٢٥٠] محمد اقبال: م.س، ص٧٠.

[٢٥١] وەرگیراوە لە: محمد اقبال: م.س، ص٧٠.

[٢٥٢] محمد خضری بك: محاضرات في التأريخ الامم الاسلامية، ص٣٦٢ " عبدالله رازی: م.س، ص١٨٨ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص١٣٧.

[٢٥٣] ابن الاثیر: م.س، ج٨، ص٢٣٧ " محمد خضری بك: چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی، ل١٤٨ " حسن کریم جاف: م.س، ج٢، ص١٤٠.

[٢٥٤] عبدالنعیم محمد حسنین: م.س، ص٧٨، ٧٩.

کارگێڕییەکەی، هەروەها بەشێوەیەکی تایبەت گرنگی بەو پۆستە دەدا کە پیاوەکانی هەموو جۆرە هەواڵێکی ناوچەکانی ژێر دەستی سەلجوقیەکانیان بۆ حکومەت دەهێنا.

هەروەها نیزامولمولك کەوتە سنووردانان بۆ قۆرخکاری کارمەندان و کاربەدەستان دەستەڵاتەکەیان تا بە باجی قورس هاووڵاتیان لەپەل و پۆ نەخەن، هەر دووساڵ یان سێ ساڵێك والی و کاربەدەستانی دەگۆڕی تا ببێتە زامنی ئەوەی یاری بە کارەکانیان نەکەن.[255]

کاتێك سوڵتان ئەلب ئەرسەلان پیشەی (پۆستەچی) و (هەواڵچی) هەڵوەشاندەوە نیزامولمولکی وەزیر لە هەموو شارێدا پیاوێکی وریای پاکی بۆ چاودێری والی و دادوەر و کاربەدەست دانا، تابزانێ کارمەندان و هاودەمەکانیان چۆن کاردەکەن و یەکسەر هەواڵی پێبدات، بەو جۆرە نیزامولمولك لە هەڵبژاردنی کارمەندان دا وورد بوو کامیان زیاتر زانستی هەبوایە و چاوچنۆك نەبوایە و دەسپاك و دنیا نەویستر بوایە، ئەوەی هەڵدەبژارد بۆ پیشەی (پۆستەچی) و (هەواڵچی) لەبەر گرنگی و حەساسی کارەکە، خەڵکانێکی دادەنا کە گومانیان پێنەبرێت، لەلایەن خودی سوڵتانەوە دادەنران.نیزامولمولك پایەی پاداشتی بە کارمەندانی دەوڵەتەکەی دەبەخشی لەترسی ئەوەی کارمەند تووشی ناپاکی ناوماڵ و سامانی دەوڵەت نەبێت، یان پایەکەی بەهەند بگرێ و دەست بەسەر ماڵ و سامانی هاووڵاتیان دابگرێت.[256]

کاروباری دەوڵەتی سەلجوقی لەپێش ئەوەی نیزامولمولك وەزارەت بگرێتەدەست ڕێکخراو نەبوو، بۆیە هەڵە و کەموکورتی دزەی کرد بووە کارگێڕی ویلایەتەکانی سەر بە دەوڵەتەکە و لە ئەنجامی وێرانبوونی زەوییەکانیدا و نەبوونی سەرپەرشتیکەرانی تا بەوجۆرەی کە پێویستە هەستێ بە بنیاد و چاکسازی کردنی باری دارایی تیایدا خراب ببوو، بەڵام کاتێ نیزامولمولك هاتە سەر وەزارەت، کاروباری ئەو ویلایەتانەی ڕێکخست و زەوییەکانی خستەوە کار و بنیادی نانەوە و دەستەڵاتی دەوڵەتی لەو ناوچانەدا سەقامگیر کردەوە کە خەریك بوو لە بازنەی دەردەچوون.[257]

نیزامولمولك لەڕووی زانستی و ئەدەبیش دا هەوڵێکی ڕوونی خستە گەڕ، ئەو ئەهلی زانستی خۆشدەویست و چاکەی زۆری لەگەڵ دەرکردن، تائەوەی مووچەی چەسپاوی بۆ زانایان بڕیبوویەوە و بەڕێکوپێکی بۆی سەرف دەرکردن، کۆڕی نیزامولمولك گەورە زانایانی لە بوارە جیاوازەکانی مەعریفە و داناییدا لوخۆ دەگرت، ئەو چەند کتێبخانەیەکی دامەزراند و کتێبی بۆ بەدەست خستن، لەڕۆژانی ئەودا وەك ئیبنولجەوزی دەڵێت: ((بازاڕی زانست لەسەردەمی ئەودا هەبوو، زانایان جێی گرنگی بوون)).[258]

نیزامولمولك لەسەردەمی ئەلب ئەرسەلان دا خوێندنگە نیزامیەکانی دامەزراند لە هەریەکە لە (بەغداد، بەصرە، ئەصفەهان، ئامل، تەبەرستان، مەرو نەیسابوور، هەرات، بەڵخ) دا بڵاوبوونەوە، هەتا دەڵێن لەهەموو شارەکانی عێراق و خۆراسان خوێندنگە هەبووە،[259] کە گرنگترینیان (نیزامیەی بەغداد) بوو کە لە ساڵی (٤٥٧ك/١٠٦٥ز) بنیادی نان گەورەزانایانی فیقهناس و فەرمووودەناس و سۆفی و فەیلەسوفەکان وانەیان تێدا

---

[255] الصلابي: دولة السلاجقة، ص١٣٧.

[256] الصلابي: دولة السلاجقة، ص١٣٧.

[257] ن.م، ص١٣٨.

[258] الصلابي: دولة السلاجقة، ص١٤٠.

[259] الذهبي: سيراعلام النبلاء، ج١٤، ص١٦٦ " عبدالطيف الطيباوي: محاضرات في تأريخ العرب و الاسلام، دارالاندلس، (بيروت، ١٩٦٣)، ج١، ص٥٢ " حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، ص٧٩.

دەوتەوە وەك (پێشەوا غەزالی)[٢٦٠] فەیلەسوفی گەورە، هەروەها (ئەبو ئیسحاقی شیرازی )[٢٦١] و چەندین گەورەزانایانی تر وانەیان تێدا ووتووەتەوە.[٢٦٢]

ئەم خوێندنگایانەی دامەزراندن بۆ پێگەیاندنی کارمەند و کەسانی کارامەی کاربەدەست لە دەوڵەتی سەلجوقیدا، بۆیە پەرەی بەم خوێندنگایانەدا تا لەرێی زانست و زانیاریەوە خەڵك لەخۆی و سوڵتانەکەی (ئەلب ئەرسەلان ) رازی بکات،[٢٦٣] هەروەها مەبەستێکی تریشیان لە دامەزراندنی ئەم خوێندنگایانە بڵاوکردنەوەی تێۆشان و جیهاد کردن بوولە نێو موسوڵمانانددا.[٢٦٤]

نیزامولمولك حەزی لە زانست بەتایبەت فەرمووده بوو، تەواو شەیدا و سەرقاڵی بوو دەیوت: ((من دەزانم لە گێرەڕوان نیم، بەڵام حەز دەکەم پەیوەستی کاروانی گوێزەرەوانی پێغەمبەری خوا (ص) بم ))، ئەو فەرموودەی لە قوشەیری و ئەبو موسلیمی کوڕی مەهری کوڕی یەزید و ئەبو حامیدی ئەزهەری دەبیست.[٢٦٥]

لەرووی شارستانیەوە وەزیری سەلجوقی نیزامولمولکی تووشی گرنگیەکی گەورەی بەدامەزراوە شارستانیەکان، بەتایبەت خانووەکانی پەرستش دەدات، ئەو چەندین مزگەوتی لە وڵاتە جیاوازەکانی ژێر دەستەڵاتی سەلجوقیدا بنیادنا، هەروەك گرنگی بە نۆژەن کردنەوەی هەردوو حەرەمی مەککەی موکەڕەمە و مەدینەی مونەووەرەدا و چەندین بینای لە عێراق و فارس دا بۆ پەرستشکاران و زاهیدان و ئەهلی چاکە و هەژاران کردووە و چەندە خۆراك و پۆشاکیان پێویست بوو بۆی برینەوە.[٢٦٦] لەشاری نەیسابوور نەخۆشخانەی بنیادنا، هەروەها کۆشکەکەی (خەوارزم ) و مەزارگەی (توس)ی نۆژەن کردەوە.[٢٦٧]

لەرووی ئابووریشەوە نیزامولمولکی لە چاکسازی کردنی زەوییە کشتوکاڵیەکان و رێکخستن و دابەشکردنیاندا رۆڵێکی گرنگی بینی، واباوبوو لەلای خەلیفە و سەرکردەکان ماڵ و سامان لە وڵات و لە پایتەخت داکۆکرایەوە، بەڵام کاتێك سنووری دەوڵەتی سەلجوقی لە سەردەمی نیزامولمولك دا فراوان بوو، تێبینی ئەوەی کرد کە داهاتی دەوڵەت لە خەراجی زەوییە کشتوکاڵیەکاندا لەبەر پێویستی چاککردنی یان گرنگی نەدانی والیەکان بەو زەویانە کەمە،[٢٦٨] بۆیە پێی وابوو چاکترین شت بۆ دەوڵەت ئەوەیە ناوچەکان لەسەر شێوەی بەش بەشەکی بەسەر سەرکردە سەربازییەکاندا دابەش بکرێت لە بەرامبەر ئەوەی هەموو پارچەیەك لەبەرامبەر بەرهەمهێنانی ئەو زەوییەی کە بۆی براوەتەوە هەندێك پارە بدات بە خەزێنەی دەوڵەت، ئەو پەیرەوە

---

[٢٦٠] غەزالی: ناوی (محمد کوڕی محمدی کوڕی أحمد لە ساڵی (٤٥٠ك/ ١٠٥٨ز) لە ناوچەی گابرانی سەر بە شاری گوس لە هەرێمی خۆراسان لە دایك بووە، شافعی مەزهەب بووە، کاریگەرییەکی گەورە و دیاری لە زۆرێك لە بوارەکانی شەرع و زانستە جۆربەجۆرەکاندا هەیە، خاوەنی ژمارەیەکی زۆر لە نوسین و دانراوە کە هاووێنەیان لە جیهانی ئیسلامیدا کەمە، وەرگیراوە لە: (أبوالحسن الندوي: رجال الفكر و دعوة في الاسلام، ط٣، دار ابن كثير، (بيروت، ٢٠٠٧ز)، ص٢٥ " ئیمامی غەزالی: دۆستایەتی و برایەتی، و/ عمر أحمد، چاپی یەکەم، بێ شوێنی چاپ، ١٤١٨ك، ل٧-٩.

[٢٦١] ئەبو ئیسحاقی شیرازی: لە بەناوبانگترین فەقیهە شافیعیەکانە، لە فەیروز ئاباد لە وڵاتی فارس لەدایك بووە، ڕۆیشتووە بۆ شیراز وانەی لای زانایانی ئەویێ خوێندووە، دواتر ڕۆشتووە بۆ بەصرە، لە ساڵی (٤١٥ك) ڕۆیشتووە بۆ بەغداد، لە گفتوگۆ و وانەکانیدا قسەکانی بە بەڵگەی بەهێز بەناوبانگ بووە لە گرنگترین دانراوەکانیشی (التنبيه، المذهب) لة فيقهدا، (طبقات الفقهاء، اللمح) لە ئصولی فیقهدا، لە ساڵی (٤٧٦ك/١٠٨٣ز) لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە. وەرگیراوە لە: (حسين أمين: الغزالي فقيهاَ و فيلسوفاَ و متصوفاَ، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٦٣)، ص١٦).

[٢٦٢] ابن الجوزي: م.س، ج٧، ص٢٣٨ " الحسيني: م.س، ص٦٨ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٠٥ " حسين أمين: العراق في العصر السلجوقي، ص٧٦ " محمد خضری بك: چەند وانەیەك ...، ل ١٥٢.

[٢٦٣] عبدالطيف الطيباوى: م.س، ص٥٣.

[٢٦٤] الاصفهانى: م.س، ص٤.

[٢٦٥] الذهبي: سيراعلام النبلاء، ج١٤، ص١٦٥.

[٢٦٦] الصلابي: دولة السلاجقة، ص١٤٠.

[٢٦٧] الذهبي: سيراعلام النلاء، ج١٤، ص١٦٦.

[٢٦٨] الصلابى: م.س، ص١٣٨.

هۆکارێ بوو بۆ گەشەپێدانی سامنی کشتوکاڵی بەوەی خاوەن پارچە زەویەکان گرنگییان دابە گرنگیدان بە زەویەکە و بو بەهۆی زیادبوونی بەرهەمەکەی ئەو نیزامە بەردەوام مایەوە تا دەوڵەتی سەلجوقی و ئاوابوو نەما.[٢٦٩]

بەم شێوەیە نیزامولمولك کەسێتیەکی گرنگی بووە بە نسبەت دەوڵەتی سەلجوقی، چونکە لە پشت زۆرێك لەو پرۆژانەوە بوو کە تەواو کران و هاتنەدی لەسەردەمی هەردو سوڵتان ئەلب ئەرسەلان و مەلیکشاهی کوڕیدا.[٢٧٠]

نیزامولمولك بناغەی فەرمانڕەوایی سەلجوقیەکانی دانا، بوونی ئەم زانا پایە بەرز و سیاسەتمەدارە بەڕادەیەك لە مێژووی ئەم فەرمانڕەواییەدا گرنگە کە هەندێك لە لێکۆڵەرەوەکانی ڕۆژگار بە هێزی سەلجوقیەکان دەگێڕنەوە بۆ نیزامولمولك.[٢٧١]

ئاییندەش ئەو ڕاستیەی سەلماند، چونکە دوای مردنی نیزامولمولك قۆناغی لاوازی و ململانێی ناوخۆیی لەناو دەوڵەتی سەلجوقی دەستی پێ کرد.

دەوڵتی سەلجوقی بەسەردەمی سێ سوڵتانەکە دەناسرا (توغرول بەگ، ئەلب ئەرسەلان، مەلیکشاه) سەردەمی ئەوان سەردەمی بەهێزی دەوڵەتی سەلجوقی بوو، ئەمەش لە سایەی چاکە و دانایی و لێهاتوویی نیزامولمولکەوە بوو.[٢٧٢]

---

[٢٦٩] ن.م، ص١٣٩.

[٢٧٠] حسنین کریم جاف: م.س، ص١٤١.

[٢٧١] عبدالله رازی: م.س، ص١٨٨.

[٢٧٢] الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، ل٤٨.

# باسی سێیەم

## کوژرانی سوڵتان ئەلب ئەرسەلان و کۆتایی هاتن بە دەسەڵاتی

ئەلب ئەرسەلان ئەوەندە نەژیا تا بەرهەمی سەرکەوتنە گەورەکەی بچێنێتەوە و بگاتە ڕزگارکردنەکانی و هەموو ئامانجە دوورەکانی بێنێتەدی لەدوای ساڵێك و چەند مانگێك کوژرا.

لەوکاتەی کە ئەلب ئەرسەلان سەرقاڵی شەڕی ڕۆم بوو،ناکۆکی و کێشە لەنێوان ئەلب ئەرسەلان و دەوڵەتی خانیەکان دروست دەبێت، دوای تەواوبوونی لە شەڕی ڕۆم و سەرکەوتنی بەسەر ڕۆمانۆسدا، بیری لەوە کردەوە کە ڕووبکاتە ڕۆژهەڵات بۆ دەرکردنی ڕەگ و ڕیشەی خانیەکان.[٢٧٣]

لەسەرەتای ساڵی (٤٦٥ك/١٠٧٣ز) دا سوڵتان ئەلب ئەرسەلان بەرەو ئەودیو ڕووبار چوو، سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد کە نزیکەی (٢٠٠) هەزار سوار بوو، پردێکی بەسەر ڕووباری جەیحوندا دروست کرد و خۆی و سوپاکەی لە ماوەی مانگێکدا لێیەوە پەڕیەوە.[٢٧٤] ئینجا بەرەو ڕووی (شمس الملك تكين كوڕی طمخاج) ڕۆیشت کە شای سەمەرقەند و بوغارا بوو، لە نزیك جەیحون شارێك هەبوو ناوی (فەربەر) بوو، ئەو شارە فەڵایەکی بوو دەست و پێوەندەکانی ئەلب ئەرسەلان سەرۆکی ئەو قەڵاییەیان بەدیل گرت سوڵتانیان هێنا، ناوی (یوسفی خوارزمی) بوو، یەکێك بوو لە ئاژاوە گێڕەکان.[٢٧٥]

فەرمانی کرد چوار مێخ لە هەر چوارپەلی بدەن و تا سزای بدات و پاشان بیکوژێت، یوسف پێی ووت: ((ئەی نامەرد کەسی وەك من دەبێ وا بکوژرێت)) سوڵتان تووڕە بوو و تیروکەوانەکەی هەڵگرت و ووتی: ((دەست و پێی ئازاد بکەن))، ئەوانیش دەست و پێیان ئازادکرد، سوڵتانیش تیرێکی بۆ وەشاند، بەڵام نەیپێکا، ئەو زۆر لە تیژهاوێژیدا ڕاست بوو کەم هەڵەی دەکرد لەسەر کورسیەکەی دانیشتبوو دابەزی و بەڕوودا کەوت، یوسفیش بەپەلە چوو بۆی و بەچەقۆیەك کەلە لاقیدابوو لێیدا، خزمەتگوزارێکی ئەرمەنی دوای یوسف کەوت و بە گورزێ دای لەسەری و کوشتی.[٢٧٦]

ئەلب ئەرسەلان وەسیەتی کرد و کوڕەکەی خۆی مەلیکشاه ئەبو شوجاع موحەممەدی کردە جێگرەوەی خۆی،[٢٧٧] پاشان لە تەمەنی ٤٠ساڵی و لە (١٠ی ربيع الاولى ساڵی ٤٦٥ك/١٠٧٣ز) بەم برینەوە کۆچی دوایی کرد، لە (ڕەی) لەلای توغرول بەگی مامی و جەغری بەگ داودی باوکی بەخاك سپێردراوە.[٢٧٨]

لەدوای خۆی ئەم منداڵانەشی بەجێهێشت: ((مەلیکشاه، ئیاز، تەکشی پوری برس، ئەرسەلان ئەرغون، سارە، عائیشە و کچێکی تر)).[٢٧٩]

دەگێڕنەوە کاتێ سەرەمەرگی دیوە ووتویەتی: ((هەرکات ڕووم کردبێتە هەر شوێنێك و بەرەوڕووی دوژمن چووبێتم و ویستبێتم بدەم لە دوژمنێك لەوکارەمدا پشتم بە خوا بەستووە و لەجوانترین باردا سەیرم کردووە،

---

[٢٧٣] الراوندی: م.س، ص١٢٠.

[٢٧٤] ابن الجوزی: م.س، ج٧، ص٢٧٦ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦٣، الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٤٠٠ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٩ " عبدالله رازی: م.س، ص١٩٠ " أمير عبدالعزيز: الوجيز في تأريخ الاسلام و المسلمين، ط١، دار ابن حزم، (بيروت، ٢٠٠٣ز)، ص٦٦٦.

[٢٧٥] الاصفهانی: م.س، ص٢١١ " ابن الاثير: م.س، ج٨، ص٢٣١ " الحسيني: م.س، ص٥٣ " الحنبلی: م.س، ج٤، ص٥.

[٢٧٦] ابن الجوزی: م.س، ج٧، ص١٧٦ " الراوندی: م.س، ص١٢٠، ١٢١ " الذهبي: دول الاسلام، ج١، ص٤٠ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٢١ " الحنبلی: م.س، ج٤، ص٦ " عبدالنعيم محمد حسنين: م.س، ص٥٩، ٦٠، حسين أمين: م.س، ٧٥ " تامارا رايس: م.س، ص٤٠ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٩٣.

[٢٧٧] الذهبي: دول الاسلام، ج١، ٤٠٠ " سيوطی: م.س، ل١٨٢ " أمير عبدالعزيز: م.س، ص٦٦٦ " حسن كريم جاف: م.س، ج٢، ص١٤٠.

[٢٧٨] ابن الاثير: م.س، ج٨، ص٢٣١ " الذهبي: سيراعلام النبلاء، ج١٨، ص٤١٧ " الصلابي: دەوڵەتی عوسمانی، ل٤٥ " عبدالعظيم رضايي: م.س، ص٦٧٠ " ن.و. ثیطولوسکایا و ئەوانی تر: م.س، ص٢٩٦ " محمد سهيل طقوش: تأريخ السلاجقة في البلاد الشام، ص١١٩.

[٢٧٩] الاصفهانی: م.س، ص٢١٣ " الحسينی: م.س، ص٤٥ " الذهبي: تأريخ الاسلام، ج٢، ص١٦٣ " ابن كثير: م.س، ج١١، ص١٢١.

بەڵام ئەمجارەیان لەسەر گردۆڵەیەکی بەرز ڕاوەستابووم و لەجوانترین باردا سەیری سەربازگەکەم دەکرد و ووتم کێ هەیە بتوانێت لەگەڵ من ململانێ بکا و بەرەنگارم بێتەوە، من بەم هێزەوە دەگەمە ئەوپەڕی چین، کەچی لەبۆسەدا مەرگم بەدیار کەوت)).[٢٨٠]

ووتراویشە سوڵتان ووتوویەتی: (( لەدەروونی خۆمدا ووتم: من پاشای دنیام و کەس توانای بەسەرمدا نیە، بۆیە خوای گەورە بەلاوازترین دروستکراوی خۆی لەپەل و پۆی خستم، من داوای لێخۆشبوونم لەخوا دەکەم و لەڕووی ئەو هەستەدا خۆم بەکەم ڕادەگرم و پێویستە لەسەر سەرکردە و فەرمانڕەواکان هەست بە بەخششەکانی خوا بکەن لەسەریان و یادی فەزڵ و چاکەی خوا بکەن و فەزڵ و گەورەییەکە بدەنەوە لای خوای گەورەی خاوەن منەت و بەخشش و ڕێز و چاکە و بەخشندەیی.[٢٨١]

کاتێك هەواڵی مردنی گەیشتە بەغداد پرسەی بۆ گێڕدرا و بازاڕەکان داخران و خەلیفە غەمباری و پەژارەی خۆی بۆ پیشان دا.[٢٨٢]

بەم شێوەیە کۆتایی بە فەرمانڕەواییەتییەکەی هات، دوای ئەوەی توانی موڵکەکانی دەوڵەتی سەلجوقی بەهۆی زیرەکی و بەهێزی و سیاسەتی بەهێزی خۆی زۆر بەگەورەیی فراوان بکات، هەرلە سنوورەکانی چینەوە، تا دەریای ناوەڕاست بگرێتەوە، بۆیە سەیر نیە هەندێ لە سەرچاوەکان ناویان ناوە (سوڵتانی جیهان).[٢٨٣]

---

[٢٨٠] الاصفهانی: م.س، ص٢١٢، ٢١٣ " الحسینی: م.س، ص٥٤ " محمد خضری بك: محاضرات تأریخ الامم الاسلامیة، ص٣٦٢.

[٢٨١] ابن الجوزی: م.س، ج٧، ص٢٧٩ " الذهبي: تأریخ الاسلام، ص١٦٣.

[٢٨٢] الحسینی: م.س، ص٥٤ " ابن كثیر: م.س، ج١١، ص١٢١، أمیر عبدالعزیز: م.س، ص٦٦٦ " الصلابي: دولة السلاجقة، ص٩٣.

[٢٨٣] نیشتمان بەشیر محمد: س.پ، ل٢١٤.

# دەرئەنجام

## یەکەم:

سەلجوقیەکان بەشێکن لە لقەکانی هۆزی غوزی تورکی، دەگێڕدرێنەوە سەر باپیرەگەورەیان کە (سەلجوقی کوڕی دقاق) ە. دوای گەیشتنیان بە جیهانی ئیسلامی مەزهەبی سونییان وەرگرت و هەموو هەوڵ و توانایەکیان خستەگەڕ بۆ سەرخستنی ئیسلام و توانیان ڕۆڵێکی کاریگەر بگێڕن لە بازنەی مێژووی ئیسلامیدا.

## دووەم:

تورغول بەگ و جەغری بەگ داود وەکو دوو کەسایەتی ناودار و لێهاتووی ناو بنەماڵەی سەلجوقی دەرکەوتن و ڕۆڵێکی گرنگ و گەورەیان بینی لە دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ سەلجوقیەکان بەتایبەت تورغول بەگ بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی دەوڵەتی سەلجوقی دادەنرێت توانی لە ساڵی (٤٣١ك/ ١٠٤٠ز) دەوڵەتێکی گەورە بۆ سەلجوقیەکان دابمەزرێنێت.

## سێیەم:

سەلجوقیەکان پاڵپشتی خەلافەتی عەباسیان کرد لە بەغداد و مەزهەبی سونییان سەرخست دوای ئەوەی خەریك بوو لە نێوان قەڵەمڕەوی (بوەیهی شیعی نێو ئێران و عێراق) و قەڵەمڕەوی (عەبیدی فاتیمی نێو میسر و شامدا) لەناو ببرێت. ئەوەبوو تورغول بەگ لە ساڵی (٤٤٧ك/١٠٥٥ز) دا چووە ناو بەغداد و کۆتایی بە دەستەڵاتی بوەیهیەکان هێنا و زاڵ بوو بەسەر هەموو ئاشووبەکانی ناو بەغداد و عێراقیشی بردە ناو قەڵەمڕەوی سەلجوقیەکان.

## چوارەم:

ئەلب ئەرسەلانی سەلجوقیی وەك کەسایەتییەکی ناوداری ناو بنەماڵەکەی دەرکەوت، چونکە هەر لە تەمەنی لاوێتیی دا دەرکەوت و ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی گێڕا، لە مەیدانی سیاسی و سەربازیی لەناو بنەماڵەی سەلجووقیدا.

## پێنجەم:

ئەلب ئەرسەلان دوای مردنی تورغول بەگی مامی دەستەڵاتی دەوڵەتی سەلجووقی گرتە دست، خاوەنی کەسایەتیەکی بەهێز و بەتوانا و سەرکردەیەکی بە هەڵمەت و کارامە بوو ناوبانگیەکی گەورەی هەبووە، ئەمەش لەبەرئەوەی سنووری دەستەڵاتی دەوڵەتی سەلجووقی لەسەردەمی ئەودا فراوانیەکی گەورەی بەخۆوە بینی.

ئەلب ئەرسەلان بوو بە سەرکردەیەکی جهیاد و مۆرکێکی ئایینی لە هێرش و پەلامار و کارە فراوانخوازییەکانی دا و سوور بوو لەسەر سەرخستنی ئیسلام و بڵاوکردنەوەی لە وڵاتانی تردا.

## شەشەم:

یەکێك لە ڕووداوە گرنگەکانی سەردەمی فەرمانڕەوای ئەلب ئەرسەلان شکست پێهێنانی سوپای ڕۆم بوو لە (مەلازگرد) لە ساڵی (٤٦٣ك/١٠٧١ز)، ئەو سەرکەوتنە بە خاڵێکی وەرچەرخان و دەستکەوتێکی گەورەی نێو مێژووی ئیسلامی دادەنرێت، چونکە ئەو قۆناغەی مێژووی ئیسلام قۆناغی درێژبووەنەوە و فراوانخوازیی بوو، سەلجووقیەکان لە دوای شەڕی مەلازگرد بە ئاسیای بچووکدا بڵاوبوونەوە و بەشێکی گەورەیان دایە پاڵ خاکی ئیسلامی و ئایینی ئیسلامیان تێیدا بڵاوکردەوە کە پێشتر هەرگیز ئیسلام نەگەیشتبووە ئەو ناوچانە.
وە بە گەورەترین و سەختترین کارەسات دادەنرێت لە مێژووی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا، چونکە زۆربەی بەشەکانی ناوچەکانی ئاسیای بچووکیان لەدەست دا، کە ئەمەش درزێك بوو کەوتە بینیادی دەوڵەتی بیزەنتی و ڕێگەی بۆ کەوتنی خۆش کرد.

## حەوتەم:

سەردەمی ئەلب ئەرسەلان سەردەمی گەشانەوەی دەوڵەتی سەلجووقی بوو لە هەموو ڕوویەکی سیاسی و سەربازی و ئیداری و زانست و ژیاریشەوە، چونکە لە سەردەمی ئەودا نیزامولمولك کە بە گەورەترین و ناودارترین وەزیرە سەلجووقیەکان دادەنرێت و بەناوبانگە بە ڕێکخستنی کاروباری دەوڵەت و خۆشویستنی زانست و زانایان و زۆر بەخشین و کارەکانی لە چاکە و خێر و بنیادنانی خوێندنگکاندا بۆ فێرکردنی موسوڵمانان دەرکەوت و ڕۆڵێکی گرنگ و کاریگەری لە سەردەمی دەستەڵاتدارێتی ئەلب ئەرسەلان دا بینی.

# لیستی سەرچاوەکان

## یەکەم: سەرچاوە عەرەبیەکان

### ا/ سەرچاوە سەرەکیەکان

ابن الأثير: عزالدين أبي الحسن على بن محمد (ت ٦٣٠هـ / ١٢٣٢م)

١- المامل في التأريخ، تحقيق: عمر عبدالسلام التدمري، داراﻟﻜﺘﺐ العربي، بيروت، ١٤٢٧هـ / ٢٠٠٦م

الأصفهاني: عمادالدين محمد بن محمد بن حامد (ت ٥٩٧هـ / ١٢٠٠م)

٢- تأريخ دولة آل سلجوق، ط١، داراﻟﻜﺘﺐ العلمية، بيروت، ١٤٢٥هـ / ٢٠٠٤م

أبي الجرادة: كمال الدين بن عمر بن أحمد

٣- بغية الطلب في التأريخ الحلب، تحقيق: سهيل زكار، دارالفكر، دمشق، د-ت

ابن الجوزي: أبي الفرج عبدالرحمن بن على بن محمد (ت٥٩٧هـ / ١٢٠٠م)

٤- المنتظم في التأريخ الملك و الأمم، دارالوطنية، بغداد، ١٩٩٠م

الحسيني: صدرالدين أبي الحسن بن علي بن أبي الفوارس ناصر بن علي (ت ٦٢٣هـ / ١٢٢٧م)

٥- أخبار دولة السلجوقية، تحقيق: محمد اقبال، لاهور، ١٩٣٣م

الحنبلي: شهاب الدين أبي الفلاح عبدالحي بن أحمد بن محمد بن العماد ( ت ١٠٨٩هـ / ١٦٧٨م)

٦- شذارت الذهب في أخبار من ذهب، تحقيق: مصطفى عبدالقادر عطا، ط١، داراﻟﻜﺘﺐ العلمية، بيروت، ١٤١٩هـ / ١٩٩٨م

ابن خلدون: أبو زيد عبدالرحمن بن محمد بن محمد (ت ٨٠٨هـ / ١٤٠٦م)

٧- تأريخ ابن خلدون، ط٥، دارالقلم، بيروت، ١٩٨٤م

الذهبي: شمس الدين أبي عبدالله بن محمد بن أحمد بن عثمان (ت ٧٤٨هـ / ١٣٤٧م)

٨- تأريخ الاسلام، تحقيق: عمر عبدالسلام التدمري، ط٢، دارالكتاب العربي، بيروت، ١٤٢٣هـ ٢٠٠٢م

٩- دوا الاسلام، تحقيق: حسن إسماعيل مروة، ط٢، بيروت، ١٤٢٧هـ / ٢٠٠٦م

١٠- سير إعلام النبلاء، تحقيق: شعيب الانوار نؤوط و محمد نعيم، ط٣، مؤسسة الرسالة، بيروت ١٤٠٦هـ / ١٩٨٦م

١١- العبر في خير من غبر، تحقيق: صلاح الدين المنجد، ط٢، مطبعة حكومة الكويت، كويت، ١٩٨٤م

الرواندي: محمد بن علي بن سليمان (ت ٥٩٩هـ / ١٢٠٠م)
١٢- راحة الصدور و آية السرور در تأريخ أل سلجوق، چاپی دووەم، چاپخانەی سپهر، تهران، ١٣٦٤.

سيوطي: جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر (ت ٩١١هـ / ١٥٠٥م)
١٣- مێـژووی خەلیفـەکانی ئیـسلام (ڕاشـیدین، ئەمـەوی، عەبباسـی)، و/ نـصرالدين عبـدالرحمن قـادر، پێداچوونەوەی: حسن محمود حمه كريم، چاپی یەکەم، چاپخانەی کۆمپانیای چاپ و پەخشی نووسەر، (١٤٢٨ك / ٢٠٠٧ز).

الشهرستاني: أبوالفتح محمد بن عبدالكريم بن اب بكر احمد (ت ٥٤٨ك/ ١١٥٣ز)
١٤- الملك و النحل، تحقيق: أمير علي مهنا و علي حسن فاعور، ط٨، دارالمعرفة، بيروت، ٢٠٠١ز.

الصفدي: صلاح الدين خليل بن أبيك (ت ٧٦٤ك/ ١٣٦٣ز)
١٥- الوافي بالوافيات، تحقيق: احمد الارناؤوط و تركى مصطفى، دار أحياء التراث، بيروت، ٢٠٠٠ز.

ابي الغداء: عمادالدين اسماعيل بن علي بن محمد بن عمر بن ديوب (ت: ٧٣٢ك/١٣٢١ز)
١٦- تأريخ أبي الغداء المسعى المختصر في أخبار البشر، تحقيق: محمود ديوب، ط١، دار الكتب العلمية، بيروت، (١٤١٧ك/ ١٩٩٧ز).

القلقشندي: أبو العباس علي بن أحمد (ت ٨٢١ك/ ١٤١٨ز)
١٧- صبح الاعشى الانشا، ط١، دارالفكر، دمشق، ١٩٨٧ز.

ابن كثير: عمادالدين أبوالغداء اسماعيل بن القرشى الدمشقي (ت ٧٧٤ك/ ١٣٧٢ز)
١٨- البداية و النهاية في التأريخ، تحقيق: حامد أحمد الطاهر، ط١، دار الفجر للتراث، القاهرة، ١٤٢٤ك/ ٢٠٠٣ز.

المقريزى: تقى الدين أبي العباس أحمد بن علي بن عبدالقادر (ت ٧٦٤ك/ ١٣٦٣ز)
١٩- السلوك لمعرفة دول المللوك، تحقيق: محمد عبدالقادر عطا، ط١، دارالكتب العملية، بيروت، ١٩٩٧ز.

ابن الوردى: زين الدين عمر بن مظفر (ت ٧٤٩ك/ ١٣٤٨ز)
٢٠- تأريخ ابن الوردى، ط١، دارالكتب العلمية، بيروت، ١٩٩٦ز.

ياقوت الحموي: شهاب الدين أبي عبدالله الرومي (ت ٦٢٦ك/ ١٢٢٨ز).

## ب/ سەرچاوە لاوەکییەکان

أمير عبدالعزيز:

٢٢- الوجيز في التأريخ الاسلام و المسلمين، ط١، دار ابن حزم، بيروت، ١٤٢٤ك/ ٢٠٠٣ز.

أمين: حسن

٢٣- تاريخ العراق في العصر السلجوقي، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٣٨٥ك/ ١٩٦٥ز.

٢٤- الغزالى فقيهاَ و فيلسوفاَ و متصوفاَ، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٦٣ز.

بروكلمان: كارل

٢٥- تأريخ الشعوب الاسلامية، ت. ر/ نبيه أمين فارس و ننبر البعليكى، ط٢، بيروت، ٢٠٠٠ز.

تاماراتالبوت رايس:

٢٦- السلاجقة تريخهم و حضارتهم، ت. ر/ لطفى الغوري و ابارهيم الداقوقى، مطبعة الارشاد، بغداد، ١٩٦٨ز.

حسن كريم جاف:

٢٧- الوجيز في تأريخ ايران، ط٢، أربيل، ٢٠٠٨ز.

حسنين: عبدالنعيم محمد

٢٨- سلاجقة ايران و العراق، ط٢، مطبعة السعادة، ١٣٨٠ك/ ١٩٧٠ز.

خضري بك: محمد

٢٩- محاضرات تأريخ الامم الاسلامية الدولة العباسية، ط٧، دارالمعرفة، بيروت، ١٤٢٦ك/ ٢٠٠٥ز.

دون أسم مؤلف:

٣٠- أخبار السلاجقة الروم، ت. ر/ محمد سعيد جمال الدين، ط١، المجلس الاعلى، الثقافة، القاهرة، ٢٠٠٧ز.

زبيدة عطا:

٣١- الترك في العصور الوسطى ابيزنطه و سلاجقة الروم و العثمانيون، دارالفكر العربي، د-م، د-ت.

شاكر: محمود

٣٢- الغلفاء العثمانيون، ط١، المكتبة الاسلامي، ٢٠٠٣.

الصلابي: علي محمد

٣٣- دولة السلاجقة، ط١، دارالمعرفة، بيروت، ١٤٢٧ك/ ٢٠٠٧ز.

طقوش: محمد سهيل

٣٤-تأريخ الدولة العباسية، ط٥، دارالنفائس، بيروت، ١٤٢٦ك/ ٢٠٠٥ز.

٣٥- تاريخ السلاجقة في البلاد الشام، ط١، دارالنفائس، بيروت، ٢٠٠٢ز.

عباس اقبال:

٣٦- الوزارة في عهد الثلاجقة، ت، ر/ أحمد كمال الدين حلمى، مطبوعات الجامعة، جامعة الكويت، ١٩٨٤ز.

عبدالطيف الطيباوي:

٣٧- محاضرات في تأريخ العرب و الاسلام، دارالاندلس، بيروت، ١٩٦٣ز.

علي ابراهيم حسن:

٣٨- التأريخ الاسلامي العالم، مكتبة النهضة المصرية، القاهرة، ١٩٧٢ز.

لسترنج: كي

٣٩- بلدان الخلافة الشرقية، ت، رم بشير فرنسيس كوركيس عواد، ط١، مطبعة الرابطة، بغداد، ١٩٥٤ز.

محمد فتحى أمين:

٤٠- الغزو و المغولي لديار الاسلام، ط١، دمشق، ٢٠٠٥ز.

الندوي: أبو حسن

٤١- رجال الفكر و دعوة في الاسلام، تقدم: مصطفى السباعى و مصطفى الخن، ط٣، دار ابن كثير، دمشق، ١٤٢٨ك/ ٢٠٠٧ز.

## دووەم: سەرچاوە كوردیەكان

تاريق محمد عبدالرحيم:

٤٢- ڤلاديميرف. مينۆرسكی (نووسينەكانی لە بارەی كورد لە سەردەمی ئيسلامەتی تا سەرهەڵدانی خەلافەتی عوسمانی)، و/ ئازاد عوبێد صالح، چاپی يەكەم، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبيری، هەولێر، ٢٠٠٨ز.

خضری بك: محمد

٤٣- چەند وانەیەك لە مێژووی ئیسلامی، و/ نهاد جلال حبيب الله، چاپی یەکەم، بیروت، ١٤٢٩ك/ ٢٠٠ز.

الصلابی: علی محمد

٤٤- دەوڵەتی عوسمانی (هۆی گەشەسەندن و ڕووخانی)، و/ أحمد عبدالرحمن و نهاد جلال حبيب الله، چاپی یەکەم، بیروت، ٢٠٠٧ز.

ئیمامی غەزالی:

٤٥- دۆستایەتی و برایەتی، و/ عمر أحمد نیزامی، چاپی یەکەم، بێشوێنی چاپ، ١٤١٨ك.

نیشتمان بەشیر محمد:

٤٦- کورد و سەلجوقیەکان (لێکۆڵینەوەیەك لە پەیوەندیە سیاسیەکان)، و/ ئیدریس عەبدوڵڵا مستەفا، چاپی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦ز.

## سێیەم: سەرچاوە فارسیەکان

عبدالعظیم رضاي:

٤٦- پیشینیه ارانیان (أز ظهور الاسلام تا انقراض قاجاریه)، جلد دووەم، تهران، د-ت.

عبدالله رازی:

٤٨- تاریخ کامل ایران (از تأسیس سلسلة ماد تا انقراض قاجاریه)، چاپی بیستەم، چاپخانەی اقبال، ١٣٨٥.

محمود بن محمد اقسرائی:

٤٩- تأریخ سلاجقه (مساکرة الاخبار و مسایرة الاخیار)، باتمام و تصحیح: عثمان توران، چاپی دووەم، چاپخانەی رشدیه، ١٣٦٢.

ن. وپیگولوسکایا، ایو. یاکوبوسکی، ای.پ. پگروشفسکی، ا.م. بلنتیسکی، ل.و. استرویوا:

٥٠- تارخ ایران (از دورات باستان تا پایان سده هیجدهم میلادی)، ت، و/ کریم کشاورز، چاپی چوارەم پیام، تهران، ١٣٥٤.

## چوارەم: فەرهەنگەکان (الموصوعات)

دائره المعارف الاسلامیه: ت، ر/ أحمد الشنتاوی و ابراهیم زکی خورشید و عبدالحمید یونس، دارالفکر، د-م، د-ت.

٥١- بر تولد: (مادة أنی)، ج٣.

٥٢- هيوار: (مادة ألب ارسلان)، ج٢.

سيف الدين الكاتب:

٥٣- أطلس تاريخ العرب و العالم، الاصدار الاول، دار الشرق العربي، سوريا، ٢٠٠٥ز.

## پێنجەم: ئەلیکترۆنیەکان

٥٤: أحمد تمام: ألب أرسلان بطل ملاذكرد.

www.islamonline.net